بەو جۆرەش ڕاپۆرتەکە ناوی سابیرو عەبدوڵلای کوڕانی کەریمی فەتاح بەگی هەمەوەند دەبات . ئەوانیش لەو ڕۆژانەدا ، بەپیشەی باووباپیرانیان ، دلێرانە بەرەنگاری داگیرکەر هاتبوون ، بەڵکۆ ئەوساکە ، وەك ڕاپۆرتەکە بۆ خۆی دەڵێ ، تەنها ئەوان لە کۆڕی خەباتدا مابوونەوەو ئینگلیزەکان کوناوکون بە فڕۆکەو سوارەو سەربازی لیڤی دوویان کەوتبوون .

ڕاپۆرتی ساڵی (1927) بە کورتی چەند لایەنێکی باری ژیانی ئەوکوردانەی خستۆتە بەر دەمی «کۆمەڵەی گەلان» کە لە ئەنجامی ڕاپەڕینە گەورەکەی شێخ سەعیدی پیراندا پەنایان هێنابووە بەر عیراق و وەك دەڵێ ناوچەی مووسڵ بەهۆی لێشاوی ئەوانەوە بەجارێك شلۆقابوو . بەپێی قسەی ڕاپۆرتەکە تاوەکو ساڵی (1927) تەنها (450) کەس لەو پەناهێنەرانە لە ناو خاکی عیراقدا مابوونەوە ، ئەوانی تریان هەموویان گەڕاونەتەوە گوندەکانی خۆیان . لەو (450) کەسەش نزیکەی (150) یان لە ناوچەی زاخۆو (250) یان لە ناوچەی دهۆك و نزیکەی (100) یان لە ناو مووسڵ خۆی و دەوروبەریدا نیشتەجێ بوون[47] .

لە ڕاپۆرتی ساڵی 1931دا [48] ژمارەیەك هۆزی ناوچەی بادینان دەبنە گاورو بەرازخۆرو لەسەر ئەوە (!) فڕۆکەکانی بەریتانیای گەورە زۆر «دلسۆزانە» دێنە دەست و بەردەبنە گیانیان . دوای یەك لاپەڕە باسی گرتنی مامۆستا تۆفیق وەهبی لە ناوەندی نیسانەوە تاوەکو (30)ی مایسی ساڵی (1931) دەخوێنی‌یەوە [49] . هەروەها چ ئەم ڕاپۆرتەو چ ڕاپۆرتی ساڵی (1930) [50] چەند جارێك باسی شەشی ڕەشی ئەیلوول و تازەبوونەوەی ڕاپەڕینەکانی شێخ مەحمود تا بەدیل گرتنی و ڕەوانە کردنی بۆ ناصریە دەگێرنەوە . کاتێك ڕاپۆرتی ساڵی (1931) دێتە سەر باسی شەڕی ئاوباریك ، کە ڕۆژی پێنجی نیسانی ساڵی (1931) قەوما ، دەڵێ کوردەکان «ئازایانە جەنگین ، هەرچەندە هێرشی فڕۆکەو پیادە بەردەوام بوو ، بەڵام ئەوان تا تاریکی داهات بەرگری‌یان کردو ئینجا کشانەوە» . دانەرانی ڕاپۆرتەکە بێ پێچ و پەنا باسی ئەوەیان نووسیوە چۆن فڕۆکەکانی ئینگلیز لە ماوەی دوو حەفتەی داهاتودا تاقیبی شێخیان کردووەو دەستیان لێ هەڵنەگرتووە تا ڕۆژی (20)ی نیسان کردوویانە بەودیودا . شێخ لەوێ گوندی پیرانی کردۆتە بنکەی نوێی[51] .

دوای چەند لاپەڕەیەك ڕاپۆرتی ساڵی (1931) باسی ئەوە دەکات چۆن ئینگلیزەکان لەسەر داوای ڕەزا شا هێزی تایبەتی‌یان کردۆتە سەر مەحمود خانی دزڵی و دەستبەرداری نەبوون تا ڕۆژی (31)ی مایسی ئەو ساڵە بە دیلی گرتوویانەو ڕەوانەی بەغدایان کردووە[52] .

ڕاپۆرتی داهاتوو کە بۆ ماوەی نێوان کانوونی دووەم و ئۆکتۆبەری ساڵی 1932 تەرخان کراوە[53] وەك ئەوانی تر بێ پەروا کۆڵێك باسی «جوامیری»ی فڕۆکە شەڕکەرەکانی بەریتانیای گەورەی دژی شۆڕشگێڕانی کورد بۆ «کۆمەڵەی گەلان» کردووە (!!) . ئەو «داستانە» خۆشە (!!) ئەمجاریان بۆتە گوڵی سەردەستەی باس و یەکەم شەش لاپەڕەی ڕاپۆرتەکەی «ڕازاندۆتەوە» . دیسان زۆر بێ پەروا ڕاپۆرتەکە باسی ئەوە دەکات چۆن بۆ ماوەیەك هێرشی فڕۆکەکانی ئینگلیز بۆسەر کورد لەبەر خاتری چاوی شینی فڕۆکەوانێك و یاریدەرێکی ، کە «چەتە» کوردەکان بەدیلیان گرتبوون ، وەستێنرا . بەڵام کاری دانەرانی ڕاست ئەوەیشیان بۆ مێژوو تۆمار کردووە چۆن ئەو «چەتانە» پیاوانە ڕەفتاری دیلەکانیان کردووەو پاش ماوەیەك ئازادیان کردوون [54] .

هیچ کامێك لە ڕاپۆرتەکانی تری ئینگلیز کە دەربارەی عیراق لە بیستەکان و سەرەتای سی‌یەکاندا پێشکەشی «کۆمەڵەی گەلان» یان کردوون لە باسی کورد بێ بەش نین . دوا ڕاپۆرتیان کە بەر لە کۆتایی ساڵی (1932) بە بۆنەی وەرگرتنی عیراق بەئەندام لەلایەن «کۆمەڵەی گەلان»ەوە پێشکەشیان کردووە بریتی‌یە لە پوختەی هەموو ڕاپۆتەکانی‌تر ، بۆیەکا بایەخی ئەمیان زۆر تایبەتی‌یە [55] . ئێمە لەو ڕاپۆرتە تەنها یەك نموونە دەهێنینەوە کە ، خوا هەڵناگرێ ، بێ پێچ و پەنا باسی باری خوێندن و خوێندەواری‌ی کورد تاوەکو سەرەتای سی‌یەکان دەکات ، واتە تا ئەو کاتەی عیراق تێیدا بووە ئەندامی «کۆمەڵەی گەلان» . لەو ماوەیەدا کە گوایە بەریتانیای گەورە بە «ناوی» «کۆمەڵەی گەلان»ەوە عیراقی دەبرد بەڕێوە ژیانی ڕووناکبیری‌ی کورد زۆر هێدی و لەسەر خۆ هەنگاوی دەنا . هەرچۆن بێ هەنگاوی ناوچەکانی تر لە هەنگاوی ئەو خێراتر بوو . بە داخەوە جاری وا هەبوو ئەو هەنگاوە بۆ دواوە بوو ، نەك بۆپێشەوە . بەوێنە بەر لەوەی شەڕی یەکەمی جیهان دەست پێ بکات ژمارەی قوتابی‌ی ناوەندی[56] لە شاری سلێمانی

خۆی دەدا لە نزیکەی (165) کەس ، کەچی بەر لەوەی عیراق ببێتە ئەندامی «کۆمەڵەی گەلان»و دوای (14) ساڵی رەبەق لە قەیمومەتی بەریتانیای پێشکەوتوو ئەو ژمارەیە هاتە سەر تەنها (10) کەس . لەوەیش خراپتر : دیسان بەر لەوەی عیراق ببێتە ئەندامی «کۆمەڵەی گەلان» ، لە ژێر سایەی بەریتانیای گەورەدا ژمارەی هەموو ئەوانەی لە قوتابخانە کوردییەکاندا دەیانخوێند ، بەپێی سەرژمێری ئینگلیزەکان خۆیان ، بریتی بوو تەنها لە (1545) کەس . کەچی بەرامبەر بەوان (6300) کەس لە قوتابخانە عیسایییەکانو (8400) کەس لە قوتابخانە جووەکان دەیانخوێند !![57] ، واتە ئەو جووانەی عیراق کە ژمارەیان نەدەگەیشتە لە صەدا سێو چواری کورد پتر لە پێنج ئەوەندەی ئەوان مافی خوێندنیان هەبوو !! .

بەو جۆرە هەر بەڵگەیەك دەربارەی کورد چووبێتە بەردەمی « کۆمەڵەی گەلان » بە دروستی وێنەی باری ناڵەباری سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابووری کوردی بۆ ئەندامانی کێشاوە ، باسی ئەو جەورو ستەمو بێمافییەی کوردی بۆ کردوون کە بە هۆی ئینگلیزو عەلقە لەگوێکانیانەوە دووچاریان هاتبوو . راستە جاروبار دەزگاکانی « کۆمەڵەی گەلان » ئاوڕیان لە کورد داوەتەوەو تەنانەت ئەو نامانەشیان بێ وەڵام نەکردووە کە نیشتمانپەروەرانی کورد بۆیانیان ناردوون[58] ، بەلام ، بێ گومان ، هەڵوەستی کۆمەڵە بەرامبەر بە کورد هیچ رۆژێك نەگەیشتۆتە نیوەی ئەو ئاستەش کە بەپێی ناوەرۆکی پەیڕەوی خۆی دەبوو بیگاتێ . ئەوەش دیسان رووی راستەقینەی « کۆمەڵەی گەلان » وەك داشی دامەی دەستی دەوڵەتە گەورەکان نیشان دەدات .

کەوابێ نیشتمانپەروەرانی کورد حەقیان بوو بە چاوی گومانو رقەوە سەیری « کۆمەڵەی گەلان » یان دەکرد . لەخۆوە نەبوو سەلام لە پارچە هەڵبەستێکی خۆیدا کە ساڵی 1933 بۆ یەکەم جار لە گۆڤاری « هاوار » ی شامدا بڵاوی کردەوە[59] « کۆمەڵەی گەلان » ی ناو نا « کوتەکی دەستی میستەر هەندرسن » ی وەزیری هەندەرانی ئەوسای بەریتانیای گەورە[60] .

لەهەمان هەڵبەستیدا سەلام دەربارەی « کومەڵەی گەلان » بە داخو زوخاوێکی زۆرەوە گوتوویە :

**« عصبة الامم » ، کۆمەڵی گەورە**
**بەپێچو پەنا بەفێڵو دەورە[61]**
**بەجۆشو کوڵ بووی بۆ کوردی هەژار**
**ئەتکوت ئەم قەومە ئەکەم ڕستگار**
**ئەگەر ڕاست ئەکەی هەڵی سووڕێنە**
**بەس بۆ سیاسەت هەڵیانپەڕێنە**
**تەریق نابیتۆ تۆ چیت پێ ئەکەن**
**( کوتەکی دەستی میستەر هەندرسن )**

دوای ئەوەی سەلام پیلانو یاریکانی « کۆمەڵەی گەلان » ریسوا دەکات دیسان رووی دەمی تێدەکاتەوەو پێی دەڵێ :

**لە عەدالەتا کەی ئەمە دەئیە**
**یاخو هەر شێوەو ئوسوڵی غەربە**
**کۆمەڵی درۆ ، جێگەی مەکرو فەن**
**( کوتەکی دەستی میستەر هەندرسن )**
**خۆ تۆ وەصی بووی ئەقوام بوون هەتیو**
**دەمی کوردت کرد بە تەڵەی تەقیو**

سەلام لەوەیش زیاتر پێی پیا دەنێو « کۆمەڵەی گەلان » ی لا دەبێتە بارەگای « فیتنەو تەزویر » و کارخانەی « فەسادو میحەن » چونکە :

**لە سلێمانی جادەی بەر سەرا**
**بە خوێناوی کورد ئاوڕشێن کرا[62]**

دوای هێنانەوەی باسەکە بەو جۆرە سەلامی داخ لەدڵ روو دەکاتەوە « کۆمەڵەی گەلان » و پڕ بەدەم لێی دەپرسێ :

**چۆن عاجز نابی لەم خوێن ڕشتنە**
**لەلای تۆ هەڵبەت حقوق کوشتنە[63]**
**ناترسی مێژوو لەعنەتت بکەن**
**( کوتەکی دەستی میستەر هەندرسن )**

شایانی باسە هەر زوو ئەم پارچە هەڵبەستەی سەلام

سەرنجی ڕوناکبیرانی کوردو ئەو بێگانانەی ڕاکێشاوە کە هەر یەکەیان لەبەر مەبەستێك بایەخ بە مەسەلەی کورد دەدەن ، کراوەتە فەرەنسیو گەرەبێتی ئەرمەنی وێنەی لێ ناردووە بۆ بارەگای « کۆمەڵەی گەلان » لە جنێف . کە مینۆرسکی ساڵی 1934) هاتۆتە سلێمانی ئەویش ڕوونووسی کردووەو لەگەڵ خۆی بردوویە . هەروەها شابەندەری ئێران لە سلێمانی وێنەی لێ ناردۆتە وەزارەتی هەندەران لە تاران ، بەتایبەتی لەبەر ئەوەش کە شیعرەکە هێرشێکی زۆری تێدایە بۆ سەر عەجەم و ئێران(64) .

« کۆمەڵەی گەلان » لە زمانی کوردیشدا ڕەنگی داوەتەوە . نووسەرانی سۆران « عصبة الامم » و « کۆمەڵی ئەقوام » و نووسەرانی « هاوار » و « ڕوناهی » « جڤاتی میللەتان » یان پێ گوتووە(65) .

بەدرخانییەکان لەو دوو گۆڤارەو نووسینەکانی تریاندا زۆرجار « جڤات »یان لە بریتی کۆمەڵو کۆمەڵەو یەکیەتی بەکار هێناوە(66) . کاتی خۆی « کۆڕی زانیاری کورد » (جڤات) ی بۆ « نقابە » ش پێشنیار کرد(67) . پێموایە پێشنیارەکەشی بەجێیە چونکە خانی (جڤین) ی بۆ « کۆبوونەوەو خرۆشانی خەڵکی بەکار هێناوە » و جگەرخوێنو کوردۆییفیش هەمان وشەیان کردۆتە زاراو .

دڵنیام لەوەی گەرانێکی ورد بەناو پاشماوەی تۆمارو بەڵگەکانی « کۆمەڵەی گەلان » دا بۆی هەیە ڕووی تری بایەخداری مێژووی کوردمان بۆ ڕوون بکاتەوە .



---

وێنەکان :

١ ـ شێخ سعیدی پیران لەناو کتێبخانەکەی محمد علی عونیدا بووە .

٢ ـ شێخ محمود بە بەرگی حوکمدارییەوە ساڵی ١٩١٨ لەگەڵ سەردار رشیدی ئەردەڵاندا .

٣ ـ سمایل خانی سمکۆ «سمکۆی شوکاک» .

٤ ـ سید طه لەپاڵ تۆپێکی دەستکردی وەستا رجبدا .

٥ ـ پێکهاتنی لەشکری کورد .

٦ ـ بوردوومانەکەی شاری سلێمانی .

٧ ـ بوردوومانەکەی شاری سلێمانی .



پەراوێزەکان :

(1) بۆ ئامادەکردنی ئەم وتارە کەڵکی زۆرم لەو موحازەرانەم وەرگرتووە کە بە یاریدەی گەلێك سەرچاوەی جیاواز بۆ پۆلی چوارەمی بەشی مێژووی کۆلێجی ئەدەبیاتی زانکۆی بەغدام ئامادە کردوون .

(2) وشەی (politika) ی گریکی لە (polis) ەوە هاتووە کە مانای دەوڵەتە . دیارە وشەی پۆلیسیش هەر لەمیانەوە هاتووە .

(3) مارکۆ پۆلۆ (M.Polo) ساڵی 1254 لەدایك بووەو ساڵی 1324 کۆچی دوایی کردووە .

(4) بەزمانی چینی (پەکین) مانای پایتەختی باکوورە .

(5) بەدرێژایی هەر چوار ساڵو سێ مانگو دە ڕۆژەی تەمەنی شەڕی یەکەمی جیهان جەنگ بۆ تاوێك لەناو خاکی فەرەنسەدا نەوەستا .

(6) « دەروازەی کراوە » واتە (الباب المفتوح ) . کاربەدەستانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ساڵی (1899) ئەو زاراوەیان بۆ یەکەم جار بەکار هێنا ، ئەوساکە دەیانویست بەو بیانووەوە خۆیان بکەیێننە بازاڕە فراوانەکانی چین کە بەدەست دەوڵەتە گەورەکانی ترەوە بوو .

(7) هەرچەندە ، وەك دواییش باسی دەکەین ، ژاپۆنو ئەڵەمانیا یەك لە دوای یەك ساڵی 1933 ، ئیتالیا دوای ئەوان ساڵی 1937 لە « کۆمەڵەی گەلان » کشانەوە ، بەڵام شوێنەکانیان مایەوە بەو هیوایەی گوایە لەگەڵ شەیتان بێنە خوارێو بگەڕێنەوە ناو کۆمەڵە .

(8) لەو کاتەدا « پارتی کۆماری » دەسەڵاتی گرتەوە دەستو ئەوەش بووە هۆیەکی تر بۆ ئەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا نەبێتە ئەندامی « کۆمەڵەی گەلان » کە بە دەستکردی ویدرۆ ویلسنی سەرەك کۆماری ڕابوردوویان دادەنا . ویلسن نوێنەری « پارتی دیموکراتی » بوو کە لەگەڵ « پارتی کۆماری » دا دوو بەرەی سیاسیی سەرەکیی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بوون .

(9) بۆ درێژەی ئەو باسە بڕوانە « تاریخ الوزارات العراقیة » ی عبدالرزاق الحسنی . هەروەها : الدکتور یونان لبیب رزق ، الدبلوماسیة الوفدیة وعصبة الامم ، ـ « السیاسة الدولیة » (مجلة) ، القاهرة ، العدد 43 ، ینایر 1976 ، ص 118 — 137 .

(10) یەن پارەی ژاپۆنە . نرخی لە گۆڕیندایە . هەر 300 یەن دۆلارێك دەبێت . ئیمڕۆکە یەن یەکێکە لەپارە هەرە بەهێزەکانی جیهان . بە قسەی بانقی مەرکەزی دینارێك نزیکەی 750 یەنە .

(11) دوای وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ژاپۆن دووەم دەوڵەتی جیهان بوو

کەڵکی زۆری لەو بارو دۆخە وەرگرت کە شەڕی یەکەمی جیهان هێنانی‌یە کایەوە .

(11) تەنانەت تانك‌و فڕۆکەشیان بۆ ناردن .

(12) ڕایخ لە وشەی ڕایخشتاغ (Reichstag) ی ئەڵەمانی‌یەوە وەرگیراوە کە بریتی‌یە لە دوو وشەی لێکدراو : (Reich) واتە دەوڵەت ، یا ئیمپراتۆری‌یەت ، لەگەڵ (Tag) ، واتە کۆبوونەوە ، یا ئەنجومەن . وەك زاراوێکی سیاسی لە سەدەی دوازدەمینەوە بەکار هێنراوە . زیاتر مانای پەرلەمان دەبەخشێ . ڕایخی یەکەم‌و دووەم دوو قۆناغی نێوان سەدەی دوازدەمین‌و کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهان دەگرنەوە . ڕایخی سێیەم ساڵی 1919 دەستی پێ‌کردو بە تەواو بوونی شەڕی دووەمی جیهان لەناو چوو . هەرچەندە ڕایخشتاغ لەژێر سایەی هیتلەردا ، وەك زوربەی دەزگا دیموکراسی‌یەکانی‌تری ئەڵەمانیا چووە خانەی نەبوانەوە ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا زۆر مێژوونووس ڕۆژگاری ئەڵەمانیای نازی‌یان ناو ناوە « ڕایخی سێیەم » . ناوی کتێبە بەناوبانگەکەی ولیەم شیرەر دەربارەی ئەڵەمانیای نازی بەم جۆرەیە : « مێژووی ئەڵەمانیای هیتلەری . دامەزراندنی ڕایخی سێیەم‌و کەوتنی » .

(13) ئەدۆلف ناوی خۆی‌و هیتلەر نازناوی هەڵبژاردەیەتی . لە ڕاستیدا خۆی ناوی ئەدۆلف شیکلگروبەرە (Adolf Schicklgruber) .

(14) لە مێژوودا بەو کارە دەگوترێ ئەنشلیوس کە وشەیەکی ئەڵەمانی‌یەو مانای خستنەسەر دەگەیێنێ . هەڵلووشینی کوردی لەبارترین وشەیە بۆ ئەو کارە .

(15) مەبەست ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوای ئەوروپایە .

(16) واتە «منظمة العمل الدولية» .

(17) بۆ درێژەی ئەو باسە بڕوانە : الدکتور کمال مظهر احمد ، الطبقة العاملة العراقیة . التکون وبدایات التحرك ، بیروت ، 1981 .

(18) « منظمة الصحة العالمیة » و « محکمة العدل الدولیة » و « لجنة الاقلیات » .

(19) مەبەست خوالێخۆشبوو حەپسە خانی نەقیبە .

(20) لەگەڵ دەست‌پێ کردنی شەڕی یەکەمی جیهاندا لەشکری ئینگلیز لە باشوورەوە کەوتە داگیرکردنی خاکی عیراق‌و تاڕۆژی یازدەی مارتی ساڵی 1917 گەیشتە بەغداو دوای ئەوە ئینجا بەرەو کوردستان کەوتە ڕێ .

(21) ئاگربەس واتە « هدنة » .

(22) بۆ درێژەی ئەوباسە بڕوانە : الدکتور فاضل حسین ، مشکلة الموصل . دراسة في الدبلوماسیة العراقیة ـ الانکلیزیة ـ الترکیة وفي الراي العام ، الطبعة الاولی ، بغداد ، 1955 (336 ص) . نامەی دوکتۆراکەیەتی کە ساڵی 1952 پێشکەشی زانکۆی ئەندیانای وڵاتە یەککرتووەکانی ئەمەریکای کردووە . چەند ساڵێك لەمەوبەر چاپی دووەمیشی دەرچو . سەرچاوەیەکی بایەخدارە بۆ لێکدانەوەی چەند لایەنێکی گرنگی مێژووی هاوچەرخی گەلی کورد .

(23) جۆرج ئەثنائێل کیرزن (Curzon) (1859 — 1925) یەکێك بوو لەپیاوە سیاسی‌یە بەناوبانگەکانی ئینگلتەرەی کۆتایی سەدەی نۆزدەمین‌و سەرەتای 1924 ، واتە لە کاتێکی زۆر ناسکی مێژووی ئینگیلتەرەو جیهاندا ، وەزیری هەندەران بوو بەو جۆرە دەوری لە « کێشەی مووسڵ » و چارەنووسی کوردا گەورەو دیار بوو .

(24) ڕۆژی 16 ی کانوونی دووەمی ساڵی 1925 ئەندامانی لیژنە گەیشتنە بەغداو پاش دە ڕۆژ لەوێوە چوونە مووسڵ‌و ئینجا کەوتنە گەڕان بە ناوچەکانی کوردستاندا .

(25) ئەمەش دەقی ناوەکەیەتی بەئینگلیزی :

( League of Nations . Question of the Frontier between Turkey and Iraq . Report submitted to the Council by the Commission Instituted by the Council resolution of September 30 , 1924 ) , Geneva , 1925 .

(26) Ibid, PP . 46 — 47

(27) ( Report on Iraq administration , October 1920 — Mrch 1922 ) , London , 1923 .

(28) ڕۆژانی « شۆڕشی بیست » کاپتەن سالمۆت لەلایەن پیاوەکانی بڕایم خانی دەلۆوە کوژرا .

(29) (Report ou Iraq administration , October 1920 — March 1922 ) , PP . 103 , 115 , 117 .

(30) Captain Fitzgibbon

(31) ( Report on Iraq administration , October 1920 — March 1922 ) , PP . 116 — 117 .

(33) ( Report on Iraq administration , April 1922 — March 1923 ) , London , 1924 .

(34) Lieutenant M.Mott

(35) Captain Bond

(36) Captain Malkant

(37) ( Report on Iraq administration , April 1922 — March 1923 ) , PP . 33 — 34 .

(38) Ibid , P . 35

(39) ئۆزدەمیر پاشا ئەفسەرێکی گەورەو لێهاتووی تورك‌و لایەنگری مستەفا کەمال بوو . ئۆزدەمیر نازناوی بوو ، ئەگینا خۆی ناوی عەلی شەفیق‌و بە ڕەگەز میسری بوو . لە حوزەیرانی ساڵی 1922 وە کەمالی‌یەکان لەگەڵ هێزێکی سەربازیدا ناردیانە ڕەواندوز . ئۆزدەمیر توانی لە نزیکەوە پێوەندی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە سەردارانی کورد دابمەزرێنێ ، هەزارو یەك کفتی شیرینی درۆی دانێ . چالاکی‌یەکانی ئۆزدەمیرو هاریکاری‌ی لەگەڵ سەردارانی کورداو بەتایبەتی لەگەڵ شێخ مەحمود ، تەواو ئینگلیزیان بێزار کردبوو . پاش ماوەیەك ئۆزدەمیر ناچار بوو بکشێتەوە ، هەرچەندە لە بارو دۆخی ئەو ڕۆژگارەدا کەمالی‌یەکان بەپاکی لەگەڵ کوردا بهاتنایە پێشەوە دەیانتوانی جێ‌پێی ئینگلیز تەواو شلۆق بکەن .

(40) ( Report on Iraq administration , April

1922 — March 1923 ) , P . 3[illegible]

(41 ( Report by His Britannic Majesty's Government on the administration of Iraq for the period April 1922 — December 1924 ) , London . 1925

(42 Ibid , PP. 32 — 33

(43 ( Report by His Brittanic Majesty 's Government to the Council of The League of Nations on the administration of Iraq for the year 1926 ) , London . 1927

(44 Ibid , P . 27

(45 ( Report by His Britanic Majesty's Government to the Council of the League of Nations on the administration of Iraq for the year 1927 ), London . 1928

(46 Ibid , P . 24

ـمقی قسەکە وەهایە :

( The stormy Petrel of Southern Kurdistan

. پیتریل ، بەتەنها مەلێکی گچکەی دەریایی زۆر دوورەفڕە ، بەڵام کە وشەی

. stormy ، ی دەچێتە پاڵ دەبێتە زاراوو بە یەکێك دەگوترێ زۆر بزێوو بەکۆبەند

ێ

(47 ( Report ... on the administration of Iraq for the year 1927 ) , PP . 24 — 25

(48 ( Report by His Majesty's Government in the United Kingdom of Great Britain and Northern Ireland to the Council of the League of Nations on the administration of Iraq for the year 1931 )

(49 Ibid , PP . 15 — 16

(50 ( Report by His Majesty's Government in the United Kingdom of Great Britain and Northern Ireland to the Council of the League of Nations on the administration of Iraq for the year 1930 ) .

(51) ( Report .... for the year 1931 ), PP. 16 — 17 .

(52) Ibid , P.31

(53) ( Report by His Majesty's Government in the United Kingdom of Great Britain and Northern Ireland to the Council of the League of Nations on the administration of Iraq for the period January to October 1932 ) .

(54) Ibid , P . 3

(55) ( Special Report by His Majesty's Government in the United Kingdom of Great Britain and Northern Ireland to the Council of the League of Nations on the progress of Iraq during period 1920 — 1931 ) , London , 1931 .

(56) مەبەست قوتابخانەی ڕوشدی‌یەیە .

(57) ( Special Report ... ) / PP. 232 — 234 هەروەها بڕوانە : عبدالرزاق الهلالي ، تاريخ التعليم في العراق في العهد العثماني 1638 — 1917 ، بغداد ، 1959 ، ص181 : محمد أمين زكي ، تاريخ السليمانية وانحائها ، ترجمة محمد جميل بندى الروزبياني ، بغداد ، 1951 ، ص 205 — 210 : ، العالم العربي ، (جريدة) ، بغداد ، 20 كانون الثاني 1931 .

(58) بڕوانە :

( Report ... on the administration of Iraq for the year 1931 ) , PP . 18 — 19 .

(59) بڕوانە :

، هاوار ، ، ساڵی دوو ، ژمارە 22 ، یەکی تەمموزی 1933 ، ل 7 هەمان پارچە یەکەم شیعری سەلامە لە دیوانەکەیدا (بڕوانە : ، دیوانی سەلام ، ، بەغدا ، 1958 ، ل 1 — 4) . لە دیوانەکەدا چەند شوێنێکی شیعرەکە پەڕێنراوە ، بەڵام ، هاوار ، دەقی وەك خۆی بڵاو کردۆتەوە .

(60) مەبەست ئارثەر هێندرسنە (A.Henderson) (1863 — 1935) کە لە ساڵی 1911 وە تاوەکو ساڵی 1934 سکرتێری ، پارتی کرێکاران ، بوو . ساڵی 1929 بووە وەزیری هەندەران ، ساڵی 1931 وازی هێنا ، واتە کە سەلام شیعرەکەی کوتووە ئەو هێشتا هەر وەزیر بووە .

(61) چەند بەیتێکی هەڵبژاردەن لە شیعرەکەی سەلام ، نەك هەمووی .

(62) سەلام ئەو شیعرەی لە یەکەم یادی شەشی ڕوشی ئەیلولدا داناوە ، واتە ئەیلولی ساڵی 1931 .

(63) خۆزگە دەیکوت : ، لەلای تۆ هەڵبەت مافدان کوشتنە ، .

(64) ئەو بەشەی لە دیوانەکەیدا چاپ نەکراوە .

(65) شیعرەکەی شێخ سەلام لە ، هاوار ، دا بە ناونیشانی ، لەبۆ جەلاقێ میللەتان ، و لە دیوانەکەیدا بەناونیشانی ، بۆ کۆمەڵی ئەقوام ، بڵاوکراوەتەوە .

(66) بەوێنە بڕوانە :

، هاوار ، ، ساڵی یەك ، ژمارە دوو ، یەکی حوزەیرانی 1932 ، ل 1 ؛ ساڵی یەك ، ژمارە چواردە ، 31 ی کانوونی یەکەمی 1932 ، ل 1 .

(67) بڕوانە :

، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ، ، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکەم ، 1973 ، ل 521 .



د .ئەورەحمانی حاجی مارف

КУРДСКО -
РУССКИЙ
СЛОВАРЬ
(СОРАНИ)

فەرهەنگی
کوردی- ڕووسی
( سۆرانی )

# هەوڵێکی مەزنی نوێ

# لە جیهانی فەرهەنگ نووسیی کوردیدا

موفرەداتی زمانی کوردی قاڵبووەی ساڵانی دوور و درێژی مێژووی گەلی کوردە و سۆرە و تۆرەی چەندین پلەو قۆناخی هەڵس و کەوتی باری ژیان و هات و نەهاتێتی . لەو ماوە درێژ و بەرفراوانەدا کە بە سروشت لە کەو دراو ن و گێژە کراون و گورگەو بنژیل و زیوانیان لێگیراوە ، لە زۆر ڕووی گرنگەوە پتەو بووەو بەخۆدا هاتۆتەوەو دەوڵەمەند بووە .

دەمێکە دەست بە کاری تۆمارکردنی وشەی کوردی کراوەو وەك ئاشکرایە ، ماوەیەکە کاری فەرهەنگنووسیی کوردی خەریکە جێگەی شایانی خۆی لە ژیانی ڕۆشنبیریی و زانستی گەلی کورددادەگرێت و هەندێك و مامۆستای دڵسۆز لەم مەیدانە پیرۆزەدا هەنگاوی گەورەیان ناوە . ئەو مامۆستایانە لە دەرگایەکی فراوانەوە چوونەتە ناو مێژووی ڕۆشنبیری کوردەوە بەوەی هەر یەکەیان لە سنووری توانستی خۆیدا ئەوەی لەباریدا بووە بۆ پاراستنی زمانی نەتەوەکەی دڵسۆزانە جێبەجێی کردووە . ئەوەی شایانی باسە ، ئەوەتە کە ئەم کارە هەر بەردەوامەو بەرەی، نوێی گەلەکەمان لەگەڵ مامۆستا قاڵبووەکانماندا لەم مەیدانە سەختەدا خەریکن . بەوێنە چەند مانگێك لەمەوبەر د .زاریٰ یوسف و د . قەناتی کوردۆ فەرهەنگێکی کوردی . (دیالێکتی کرمانجیی خواروو) ڕووسییان بڵاوکردەوە .[1]

کوردناسانی یەکێتی سۆڤێت گرنگییەکی زۆریان بە نووسینی فەرهەنگی کوردی داوە ، بەڵگەی ئاشکراش ئەوەیە ، کە تا ئێستا گەلێك فەرهەنگیان چاپکردووە .[2] ئەمەش بە گشتی لە گەشەپێدان و پێشخستنی زمانی کوردیی و کاری فەرهەنگنووسیدا دەورێکی گەورەو دیاری بینیوە .

د .قەناتی کوردۆی شا سواری ئەم مەیدانە ، کە لە نووسینی فەرهەنگی کوردی (دیالێکتی کرمانجیی ژووروو) - ڕووسی بووەوە[3] ، بیری دانانی فەرهەنگێکی کوردی (دیالێکتی کرمانجیی خواروو) - ڕووسی هەراسانی کردو پاش ماوەیەك لەگەڵ د .زاریٰ یوسف دەستیان دایە ئەو کارە مەزنەو چەند مانگێك لەمەوبەر ئەم فەرهەنگە کە بەرهەمی ڕەنجی چەند ساڵەیان بوو لەچاپ دراو سەرکەوتنێکی گەورە لە کاری فەرهەنگنووسیی کوردیدا بەدەست هێنرا .

**ئەم فەرهەنگە** (752) لاپەڕەیەو نزیکەی (25) هەزار وشەی کوردی تێدایە ، کە ماناکانیان بە ڕووسی لێکدراونەتەوە .

د . قەناتی کوردۆ پێشەکی بۆ ئەم فەرهەنگە نووسیوەو . لە بارەی کۆکردنەوەو هەڵبژاردنی وشە کوردییەکان و سازکردنی بەشە ڕووسییەکەی و چۆنیەتی ڕێکخستن و دانانی فەرهەنگەکەوەو ... (ل 5 — 8) تێیدا دواوە . ئەم پێشەکییە لە لایەن د . جەمشید حەیدەرییەوە کراوە بەکوردی و لە (ل 9 — 15)دا چاپکراوە . وای بەباش دەزانم لە سەرەتادا لەڕێی ئەو پێشەکییەوە فەرهەنگی ناوبراو بە خوێنەر بناسێنم و دوایی بیروڕای خۆم بخەمە پێش چاو .

## «پێشەکی»

ئەم فەرهەنگە ، یەکەم فەرهەنگی کوردی رووسی یە ، کە لێکسیکی زمانی ئەدەبیی هاوچەرخی کوردی عێراقی ، لەسەر بناغەی لێکسیکی زاراوی (دیالێکتی) خوارووی زمانی کوردی - «سۆرانی» تێدا تۆمار کراوە .

زمانی ئەدەبی کوردی لە سەرەتاوە دوو فۆرمی جیاوازی هەبووە - زاراوی خواروو (باشوور)و زاراوی ژووروو باکوور) - و شان بە شانی یەك ئەم دوو زاراوە لە پێشکەوتندان .

کوردەکانی کوردستانی عێراق (ناوچەی سلێمانی ، هەولێر ، رەواندووز ، کۆیسنجاق و کەرکووك) بە زاراوی سۆرانی دەدوێن ، هەروەها کوردەکانی کوردستانی ئێران (ناوچەی مەهاباد ، شنۆ ، بانەو سەنندووج) هەمان زاراویان هەیە . کوردەکانی کوردستانی تورکیاو سوریاو هەندێ ناوچەی کوردستانی عێراقیش ، وەك : ئامێدی ، ئاکرێ ، دهۆك و چیاکانی ژەنگار بە زاراوی کرمانجی ژووروو دەدوێن ، هەروەها کوردەکانی ژووروی رۆژئاوای ئێران لە شاری خۆیەوە تاکو کەناری گۆلی وەرمێ و ناوچەکانی بوجنوردو کوچان (خۆرسان) ئاخاوتنی پێ دەکەن . جگە لەمانیش کوردەکانی یەکیەتی سۆڤیەت (ناوچەکانی پشت قەوقاس و ئاسیای ناوەراست) بەم زاراوە دەدوێن .

لە لێکسیك و فۆنەتیك ، بنیاتی رێزمانیدا هەردوو زاراوی ژووروو خواروو جیاوازییان هەیە ، بەتایبەتی دەبێ پەنجە بۆ ئەوە رابکێشین ، کە راناوی کورتکراو (- م ، - ت ، - ی (ئی) ، - مان ، - تان ، یان) ، لە سۆرانیدا بە پێچەوانەی کرمانجی ژوورووەوە لە بەکارهێنانی کارو گەردان‌کردنیدا وەزیفەیێکی فراوانیان هەیە . لە سۆرانیدا هەست بەوە دەکرێت ، کە فلێکسی ناو بەرەو بزربوون دەچێت . هەرچەندە لە ناوچەکانی سۆرانی وەك (هەولێرو رەواندووزو مەهاباد)دا جیاوازی نێوان نێرو مێ بە نیوەچڵێ یاخود بە تەواوی هەر ماوە. بەلام لە ناوچەی سلێمانیدا بە تەواوی وون بووە . لە هەمان کاتدا لە کرمانجی ژوورووەدا جیاوازی کەتیگۆری ناوی نێرو مێ هەر ماوەو بە تەواوی بوونی خۆی پاراستووە - وە یا لە فۆرمی ئیزافەت و فۆرمی (کازوس ئۆبلیکوس)ی چەماوە دا بەرووتی دەردەکەوێ . فۆنەتیکی سۆرانی ئەمە رووخسارە تایبەتی‌یانەی هەیە :

1 - لێوەکی (لیوو لێو) [و - w] لەباتی [ڤ - v]ی کرمانجی .

2 - لە سۆرانیدا (ل)و (ڵ) هەن ، لە کرمانجیدا تەنها (ل) هەیە .

3 - مەسەلەی فۆنێم تاکو ئێستا دەربارەی دەنگەکانی P,t,k و P',t',k' (پ ، ت ، ك) روون نەکراوەتەوە .

4 - جۆری نەرم‌بوونی دەنگەکانی (ك ،گ) لەبەر دەنگە بزوێنەکانی رێزی پێشەوە لە هەندێ لە گوفارەکاندا رەچاو دەکرێت ... هتد . هەروەها لە نووسیندا جیاوازی لە نێوان ئەم دوو زاراوەدا هەیە . ئەدەبیاتی زاراوی کرمانجی ژووروو بە زۆری بە پیتی لاتینی چاپ دەکرێت ، جگە لە کوردەکانی وولاتی سۆڤیەت ، کە بەرهەمەکانیان بە پیتی رووسی چاپ دەکەن ، بەلام ئەدەبیاتی زاراوی کرمانجی خواروو بەپیتی عەرەبی چاپ دەکرێت و دەنووسرێت و دەستکارییەکی وەهای ئەلفوبێی عەرەبییەکە کراوە ، کە لەگەڵ زمانی کوردیدا بگونجێت .

لە مێژووی وشەنووسینی کوردیدا فەرهەنگی وەرگێراو لێکدراوی کوردی هەیە ، کە لێکسیکی زمانی کوردی بە هەردوو زاراوەیەوە شوێنی خۆیان تێدا کردوتەوە .

مێژووی دانان و چاپکردنی فەرهەنگ بە زاراوی کرمانجی لە پێشەکی‌یەکەی فەرهەنگی کوردی - رووسی ق . کوردۆدا نووسراوە[4] . و بە تایبەتیش لە نامەی دوکتۆرای ئاورەحمانی حاجی مارفدا ، کە ئەسپرانتورەی لە ئامۆژگای رۆژهەلاتناسی لێنینگراد تەواو کردوو ، بەگشتی نووسراوە[5] .

ئەو فەرهەنگانەی ، کە بەتایبەتی لێکسیکی زاراوی سۆرانییان تێدا تۆمارکراوە ، ئەمانەن : **فەرهەنگی خاڵ** بە هەرسێ بەشەکەیەوە[6] ، کە لەتەك وشەکانی ئاخاوتنی سۆرانیدا ووشەی گۆڤەرەکانی (زاراوەکانی) تریشی تێدا تۆمارکراوە (مەبەست لەو ووشانەیە ، کە لە گۆڤەرێکی ترەوە هاتوونەتە نێو سۆرانی‌و ، لە فەرهەنگدا شوێنی خۆیان گرتووە ، دانەر نیشانەی چاوگەکەیان دەکات . فەرهەنگی خاڵ زۆر دەوڵەمەندە مەتریاڵی جۆرجۆری لێکسیکی هەمەرەنگەوە ، هەروەهاش نرخی تایبەتی ئەم فەرهەنگە لەوەدایە ، کە جۆری نووسین و فۆنەتیکی تێدا رەچاو کراوە .

**فەرهەنگی کوردی - عەرەبی گیوی موکریانی**[7] لێکسیکی ووشەکانی ناوچەی سۆران و بادنیان دەگرێتەوە . ژمارەیێکی زۆری ووشەی تێدا تۆمارکراوە ، بەلام فرازیەلۆژی تێدا دەست نیشان نەکراوە ، بێجگە لە فرازیۆلۆژی رێزمانی نەبێت . ئەم فەرهەنگە بە یەکێ لە فەرهەنگەکانی وەرگێراوی

کوردی دەژمێردرێت .

**کوڵکەزێڕینە ـ فەرهەنگی (کوردی ـ فارسی ـ عەرەبی ـ فەرەنسی ـ ئینگلیزی)** بابەتییە ، گیوی موکریانی دایناوەو پاشکۆیێکی فەرهەنگۆکی کوردی ـ ئینگلیزی ئاخاوتن لە گەڵدا بڵاوکراوەتەوە[8] .

لێکسیکی سۆرانی لەگەڵ کورتە باسێکی ڕێزمانی ، لە فەرهەنگەکەی عەلائەدین سەجادیدا ، کە بە زمانی کوردی ـ عەرەبی ـ فارسی دانراوە هەیە[9] . ئەمانە ئەو فەرهەنگە بابەتیان بوون ، کە لێکسیکی زاراوی سۆ رانیان تێدا تۆمارکراوەو ئەم بابەتە لێکسیکانە دەگرنەوە : ووشەی ناوماڵ ، ناوی نەخۆشی ، بەشەکانی لەش ، کات و شوێن ... هتد . هەر بەشێك لەم بەشانە بە نموونەی بەکارهێنانی ووشەکانەوە کۆیایی دێت .

**فەرهەنگی کوردی ـ ئینگلیزی تۆفیق وەهبی و ك . ئەدمۆندس**[10] بریتییە لە ووشەکانی زمانی ئەدەبی ئێستای کوردی عێراق ، بە پیتی لاتینی چاپ کراوە . لەم فەرهەنگەدا دانەران دەستنیشانی ئەو ووشانە دەکەن ، کە لە زمانێکی بێگانەوە کەوتوونەتە نێو زمانی کوردی ، وەك فارسی ، عەرەبی ، تورکی . ئەم فەرهەنگە بە پێچەوانەی ئەوانەی لە سەرەوە ناومان بردوون ، لایەنی ڕێزمانیشی تێدا تۆمار کراوە ، ووشە ئەگەڕێنێتەوە سەر بەشەکانی ئاخاوتن ، کاری تێپەڕو تێنەپەڕ دەستنیشان ئەکات . ئەمەش نرخێکی تایبەتی هەیە لە بارەی پێشاندانی فۆرمی گەردان و بناغەی «کار» (فێل)ەکانی (ئێستا)وە ، فەرهەنگی ناوبراو پاشکۆیێکی تایبەتی لەگەڵدایە ، ئەو پیشان دەدات کە کوردەکان چ جۆرە ساڵنامەیەکیان بەکارهێناوە ، لیستەی ناوی کوردی ، ناوی هەندێك شارو نموونەی گەردانی کار .

بێگومان ئەم فەرهەنگە لە ڕووی زانیارییەوە زۆر بەنرخە ، بەڵام لە بەکارهێناندا نەختێك گرانە ، چونکە ووشە کوردییەکان تەنیا بە پیتی لاتینی نووسراون و بەراوردەکەی بە عەرەبی نەنوسراوە ، جگە لەوەی فەرهەنگەکە بە پرینتسیپی هێلانەیی دانراوە (مەبەست لەم پرینتسیپە ئەوەیە کە ووتارەکانی فەرهەنگ ڕەگی «کار» یاخود ووشە ئەکاتە بناغە ، واتە هەموو ووشەکانی ، کە لە ڕەگدا یێکن و یەك چاوگەیان هەیە ، یەك لە دووای یەك دەنووسرێن . ئەم پرینتسیپە دۆزینەوەی ووشە گران دەکات .

**فەرهەنگە «کشت و کاڵ»ەکەی مەعرووف قەرەداغی مەردووخی**[11] کە بە یارمەتی کۆڕی زانیاری کورد چاپکراوە ، وەك فەرهەنگێکی تێرمنەلۆژی نرخێکی تایبەتی هەیە . ئەم فەرهەنگە ژمارەیەکی زۆری لێکسیکی کشت وکاڵی تێدا تۆمار کراوە . لەوانە (ناوی کەڵوپەل ، ئامرازی کارکردن ، بەرهەمەکانی کشت و کاڵ و تفاقی ناوماڵ ، ئاژەڵ ، دارو درەختی کوردستان) . فەرهەنگەکە ئەوە پیشان ئەدا ، کە ووشەکان سەر بە چ ناوچەیەکن و لەکوێ بەکار دێن و هەروەها سەر بە چ گۆفەریکی زاراوی ترن . ئەم فەرهەنگە سەرچاوەیەکی گرنگە بۆ لێکۆڵینەوەی جۆری ژیان و کولتوری گوندییەکان .

لەم ساڵانەی دواییدا ، لیژنەی فەرهەنگ و زمانی کۆڕی زانیاری کورد لە عێراق ، هەوڵێکی باشی داوە بۆ دانانی تێرمنەلۆژی سیاسی (رامیاری) ، کۆمەلایەتی ، زانیاری و ئیداری و هەمەجۆری . تاکو ئێستا کۆڕ توانیویەتی ئەم بەشانە ئامادەو چاپ بکات و بڵاویان بکاتەوە .

**لە ساڵی 1977**دا بە یارمەتی کۆڕی زانیاری کورد جزمی یەکەمی قامووسی کوردی ـ کوردی ، عبدالرحمن محمد امین زەبیحی دەرچووە[12] ، بڕیار وایە بە دە جزم هەموو قامووسەکە چاپ بکرێت . ئەم فەرهەنگە لێکسیکی هەردوو زاراوە سەرەکییەکەی زمانی کوردی دەگرێتەوە . دانەر لە فەرهەنگەکەیدا ووشەی هەر لە فۆلکلۆرەوە تا بەرهەمی نووسەرو شاعیران و تەنانەت ووشەی ناو فەرهەنگەکانی تریشی بەکار هێناوە . ئەگەر بەشەکانی تری ئەم فەرهەنگە چاپ بکرێن ، بێگومان ئەم فەرهەنگە بەشدارییەکی گەورە لە لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا دەکات و کەلێنێکی گەورەی کتێبخانەی کوردی پڕ دەکاتەوە .

ئەم فەرهەنگەی ئێمە ، لێکسیکی زاراوی کرمانجی خوارووی زمانی کوردی (سۆرانی) بەتایبەتی ئاخاوتنی گۆفەری سلێمانی دەگرێتەوە . شایانی باسە ، ئەم گۆفەرە ئێستا پەلی هاویشتووەو وەك نموونەی زمانی ئەدەبی کوردی لە سنووری کوردستانی عێراقدا خۆی چەسپاندووە . لە کوردستانی عێراقدا ، ئێستا سۆرانی . زمانی خوێندن و نووسینی شێوەی ڕۆژنامەو گۆفارو بەرهەمە زانستییەکانە . لە سەرەتای ساڵانی بیستەوە چاپ و چاپەمەنی لە کوردستانی عێراقدا سەری هەڵداوە . دیوانی شاعیرەکانی سەدەی نۆزدەهەم و بیستەم ، وەك نالی و سالم و کوردی و حاجی قادری کۆیی هاتوونەتە چاپکردن . هەر لەو سەردەمەشەوە ئەدەبی

حی کوردی چاوی هەڵهێناوەو نەش و نمای کردووە . شاعیری سە نو چیرۆکنووسی گەورە لە ئەدەبی کوردیدا سەریان مە وە . شاعیرانی وەك پیرەمێردو سەلام و زێوەرو بێکەس و گـ ن و هەژار ، چیرۆك نووسانی وەك ئیبراهیم ئەحمەدو محەمەد محەمەد ئەمین و هتد . هەر لەو ساتانەشەوە ڕۆژنامە حوسێتی پەرەی سەندووەو زانایانی کورد بە سەدان بەرهەمی حین دەربارەی مێژووو کولتووری میللەتی کورد ، کتێبی ـوتبخانە ، فەرهەنگەکانی کوردی و مەتریاڵی فۆلکلۆری ـلوکرنوتەوەو چاپ کردووە .

نەبەر نەبوونی فەرهەنگێکی کوردی - ڕووسی ، حیـخەری ڕووسی زمان لەم هەموو بەرهەمانە بێبەشن . جگە حمەش پەیوەندی ئابووری و کولتووری نێوان وولاتی ئێمەو کۆمەری عێراق کەوتە بارو دۆخێکی پێشکەوتووەوە ، لەبەر حمەش چاپکردنی ئەم فەرهەنگە جگە لە لایەنە زانستییەکەی ، دیمێکی پراکتیکیشی هەیەو شتێکی پێویستی ئەم قۆناغەی پەیوەندی ئێمەو ولاتی عێراقە . ئەم فەرهەنگە ئەبێتە سەرچاوەیەکی یارمەتیدانی ئەو کوردانەی کە ئەیانەوێ فێری زمانی ڕووسی ببن .

ئەمە یەکەم فەرهەنگی کوردی - ڕووسییە لە ولاتی ئێمەو ممنـمران ، کە بە لێکسیکی زاراوەی سۆرانی داندرابێت . ئەم فەرهەنگە نێزیکەی 25 هەزار ووشەی زمانی ئەدەبی کوردی تێدا تۆمار کراوە ، قەوارەی فرەوانی فەرهەنگ لەوەدایە ، کە هەموو جۆرە لێکسیکی گرتوتەوە ، لە هونەری و زانیاری و ـ میاری و کۆمەلایەتی و ناومال تا دەگاتە ووشەکانی بەرهەم و بەرهەمـ هێنان ، بەلکو جاری وەهاش هەیە ووشەی وای تێدایە ، کە خاسیەتی چینێکی یا کۆمەڵ دەردەخات وەکو چینی جوتیاران یاخود کۆچەران . جگە لەوەی ووشەی خەڵکی شاریشی تێدا تۆمارکراوە . ئەم لێکسیکانە مێژووی کولتوورو خووڕەوشت و ژیانی کورد پیشان دەدات و فەرهەنگ دەولەمەند ـەکات .

ئەم فەرهەنگە بە جۆرێکی گشتی ووشەی ئەدەبیانی کلاسیکی زاراوی خوارووی کوردی تێدا تۆمارکراوەو ووشەی ناخاوتنی ناوبازاڕیشی گرتۆتە خۆی . سەرباری ئەوەی ووشەی زاراوی دراوسێش لە فەرهەنگەکەدا هەن ، چونکە زۆر زەحمەتە لە نێوان خۆیی و دراوسێی لە ووشەدا سنوورێکی تەواو بۆ ئەو گۆڤەرانە دابنێین . هەروەها کۆمەلێ لەو ووشانەش ، کە لە زمانەکانی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاواوە کەوتوونەتە ناو زمانی کوردی ، یاخود ووشەی تازە دروستکراوان ، لەم فەرهەنگەدا جێی خۆیانیان کردۆتەوە .

فەرهەنگە کەمان جۆری فۆنەتیك و نووسینی ووشەی سادە ، ووشەی لێکدراوو پێکەوە بەستراو لە واتەو بنیاتی ڕێزمانیدا نیشان دەدات و دەری دەخات .

ووشەکانی کوردی بە پیتی عەرەبی نووسراون ، بەلامە لە کەوانەدا بە پیتی لاتینی وێنەیان کێشراوە بە (ترانسکریپسی) بەو جۆرەی کە (بەدرخان) داینـاوەو لە ڕاستیشدا باشترین ڕێنووسێکە کە لەگەڵ فۆنێم و ووشەی کوردیدا بگونجێ و یارمەتییەکی باشی ئەو کەسانە دەدا کە دەتوانن فەرهەنگەکە بەکاربهێنن و بەلام پیتی عەرەبی نازانن ، چونکە لە فەرهەنگەکەدا جەدوەلی پیتی لاتینی و عەرەبی بەرامبەر یەك نووسراون .

هەروەها لەم فەرهەنگەدا چەند لێکسیکی تریش هەیە ، کە تیایاندا جۆری گەردانی فێڵ (کار) پیشان دراوەو چەند زانیارییەکی ڕێزمانیش پێشکەشی خوێنەران کراوە ، لە هەمان کاتدا لیستەی کارە سادەکانی ڕەگی خراوەتە پال فەرهەنگەکە .

دانەران بەم جۆرەی خوارەوە پیتەکانیان ئامادە کردوو :
ق . کوردۆ وشەکانی ئەم پیتانەی ئامادە کردووە : **ئا ، ب ، پ ، ت ، ح ، د ، ع ، م ، ن ، هـ ، ئە) هەروەها مارف خەزنەدار سێ پیتی (ق ، غ ، ج)ی ئامادەکردووەو ق . کوردۆ وەری گێڕاون بۆ ڕووسی و بەم جۆرەی ئێستا بۆ فەرهەنگەکە ئامادەی کردوون . زارێ یووسف ووشەکانی ئەم پیتانەی خوارەوەی ئامادە کردووە : چ ، خ ، ڕ ، ز ، ژ ، س ، ش ، ف ، ڤ ، ك ، گ ، ل ، و ، ئو ، ئۆ ، ی ، ئی ، ئێ .**

دانەران لە کاتی خەریکبوونیاندا بە دانانی ئەم فەرهەنگەوە پرس و ڕاوێژیان لە کوردەکانی عێراق کردووەو مارف خەزنەدارو جەمشید حەیدەری (هەولێر) ، کاوس قەفتان و کەمال مەزهەرو ئاوڕەحمانی حاجی مارف (سلێمانی)و کەریمی ئەیووبی (مەهەباد) - کوردستانی ئێران - و کەسانی تر یارمەتییان داون .

ڕەنگە ئەم فەرهەنگە بەم جۆرەی ئێستا وەکو یەکەمین تاقیکردنەوە بێ کەم و کوڕی نەبێت ، بەلام سەرەتای ئەنجامدانی کارێکی زانیاری گەو رەو پراکتیکییە لەبەردەم کوردناساندا و ڕێگەیان بۆ خۆش دەکات .

دانەران هیوادارن کە ئەم فەرهەنگە ببێتە یاریدەدەرێکی بەکەڵك بۆ ئەوانەی لە زمان و ئەدەبی کوردەکانی عێراق و ئێران دەکۆڵنەوەو دەخوێنن ، هەروەها سوودبەخشیشە بۆ ئەو کوردانەی کە دێنە وڵاتی سۆڤیەت و زمانی رووسی دەخوێنن .

**ق . کوردۆ**

**جەمشید حەیدەری لە رووسییەوە کردوویەتی بە کوردی .**

* * *

لە سەرەتای نووسینی هەموو فەرهەنگێکدا کێشەی کۆکردنەوەو هەڵبژاردنی وشە دێتە پێشەوە . بنچینەی هەڵبژاردنی وشە پێوەندە بە جۆرو بابەت و مەبەستی فەرهەنگەوە . تاکو ئێستا کێشەی هەڵبژاردنی وشە بۆ فەرهەنگ لە هیچ وڵاتێکی جیهاندا شێوازێکی زانستیی تەواوی وەرنەگرتووەو هەندێ رووی ئەم مەسەلەیە هەر بە ئاڵۆزی ماوەتەوەو هەروەك زانای گەورەو فەرهەنگنووسی ناسراوو بەناوبانگی رووس ئەکادیمی ل . ف . شێربا دەڵێ : «کێشەی هەڵبژاردنی وشە بۆ فەرهەنگ یەکێکە لە کێشە هەرە زەحمەتەکانی فەرهەنگ نووسین»[٣] ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە ئەوە لەبیر نەکەین کە لە تیۆریی فەرهەنگنووسیدا هەنگاوی گەورە نراوەو گەلێك کاری ئاڵۆز خاوکراوەتەوەو رێنمایەکی وەها دانراوە کە فەرهەنگنووسەکان پەیرەوی بکەن و لە رێگەیەوە لەگەلێك کۆسپ رزگاریان بێت . هەروەها دانانی ژمارەیەکی زۆر لە فەرهەنگ ـ واتە لە ئەنجامی هەوڵ و کۆشش و زانین و ئەزموونی فەرهەنگ نووسەکاندا سەرمەشقێ هاتۆتە کایەوە .

هەرچەندە مەسەلەی کۆکردنەوەو هەڵبژاردنی وشە کارێکی گرانە ، بەلام ئەو رێنما تیۆریی و پراکتیکییەی کە تا ئەمرۆ هاتۆتە کایەوە ، ئەم کارەمان بۆ ئاسان دەکات .

شایانی باسە ، دانەرانی فەرهەنگی کوردی ـ رووسی لە کۆکردنەوەو هەڵبژاردنی وشەدا کەڵکیان لە رێبازی تیۆریی و پراکتیك وەرگرتووەو لەم رووەوە بەپێی ئەو مەبەستەی لە پێشەکیدا بۆ دانانی فەرهەنگەکە دیارییان کردووە ، بەگشتی سەرکەوتوون .

ئەگەرچی د . کوردۆ و د . زاریێ زۆر بایەخیان بە کۆکردنەوەو هەڵبژاردنی وشە داوە ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا لەم لایەنەوە لە فەرهەنگەکەدا هەندێ کەم و کورتی دەبینرێ . بە وێنە :

راستە لەم فەرهەنگەدا زوربەی ئەو وشانەی لە ئەدەبیات و ئاخاوتنی دیالێکتی خوارووی کوردیدا بەکاردێن ، دەبینرێن ، بەلام لەگەل ئەوەشدا ژمارەیەکی زۆر وشە هەن نەکەوتوونەتە ناو فەرهەنگەکەوە ، کە وەنەبێ کەمتر بەکاربهێنرێن ، وەك لە بەشێك لەو وشانەی کە کەوتوونەتە ناوەوە . بۆ نموونە : ئانجانە ، ئاوانتە ، ئاچغ ـ ئاچوغ ، ئۆف . هەندێکی تر لەناو فەرهەنگەکەدا نەنووسراون و ئەوەش کە هێندێکیان بە رەسەن کوردی نین نابێت ببێتە کۆسپ لەبەردەمی ئەوەدا کە نەخرێنە ناو فەرهەنگەکەوە ، چونکە زوربەیان لە هەموو سووچێکی کوردستاندا زانراون و بوونەتە موڵکی کورد . هەروەها بۆ پتر سەلماندنی ئەمە رایە ، لە فەرهەنگی ناوبراودا گەلێك وشەی بێگانە تۆمارکراوە .

لەو کۆمەڵە وشانەی لە دروست بووندا پێوەندییان لە نێواندا هەیە ناتەواوی دەبینرێ ، بۆ نموونە وشەی «ئابروو ، ئابرووبردن ، ئابرووچوون ، ئابرووڕژان ، ئابرووچوو ، ئابروودار ، ئابروومەند» هەیەو کەچی «ئابرووبران ، ئابرووبەرە ، ئابرووتکان ، ئابرووتکاو ...» نییە . وشەی «ئابووری» دراوەو «ئابوور» بە واتای «حەیا ، داوێن پاکی ، شەرەف ، شانازی ، ناموس» نەدراوە . وشەی «ئاتەش ، ئاتەشپەرست ، ئاتەشخانە ، ئاتەشك ، ئاتەشگا ، ئاتەشی» تۆمارکراوە ، بەلام «ئاتەشبازی ، ئاتەشپەرستی ، ئاتەشخان ، ئاتەشکێش ، ئاتەشکەدە ، ئاتەشگەردان ...» نەنووسراوە . وشەی «ئاخر ، ئاخری ، ئاخرەمین ، ئاخرین» دەبیزێ ، کەچی «ئاخربوون ، ئاخرخێر ، ئاخرزەمان ، ئاخرشەڕ ...» بەرچاو ناکەون . «ئاردەمشار ، ئاردەوا» هەیەو «ئاردە برنج ...» نییە . «ئاژەڵدار» نووسراوەو «ئاژەڵداری» تۆمارنەکراوە ... هتد .

ئێمە سەربارەت بە هەڵبژاردنی وشە کوردییەکانی فەرهەنگی ناوبراو ، ئێستاش با ئاورێك لە چۆنێتی سازکردنی بەشە رووسییەکەی بدەینەوە :

وەك ئاشکرایە ، لە نێوان وەرگێڕان و تیۆری نووسینی فەرهەنگێك کە لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر بێت پێوەندی بەهێز هەیەو بنچینەی وەرگێڕانیش بایەخێکی تەواوی هەیە لە دانانی ئەو جۆرە فەرهەنگانەدا ، هەروەها ئەو فەرهەنگانەش لە کاری وەرگێڕاندا کەڵکێکی زۆریان هەیە[٤] .

هەرچەندە لەم بارەیەوە بە شێوەیەکی تیۆری هیچ

ـووسراوێکی وەهامان نییە کە شایانی باس بێت ، بەلام لەگەل ئەوەشدا هەندێ شت لە ڕووسییەوە بۆ کوردی ، یاخود لە کوردییەوە بۆ ڕووسی وەرگێڕاون و لەم ڕووەوە تەجروبەیەکی ـچووک هەیە . ئەمەو هەروەها سوود وەرگرتن لە تیۆری وەرگێڕانی ڕووسی ڕێگەیان بۆ د . کوردۆو د . زارێ ئاسان کردووە لە نیشانکردنی جۆری وەرگێڕانی وشە کوردییەکانی فەرهەنگەکەیان بۆ سەر زمانی ڕووسی .

بێگومان لە نووسینی فەرهەنگێکی وەهادا ، بۆ وەرگێڕان و لێکدانەوەی وشە کوردییەکان بەتایبەتی وەرگێڕانی مطلق ((abso lute)) و جزئی ((partial)) و شەرح ((description)) پێویستە ـموری سەرەکی ببینن .

وەرگێڕانی مطلق ئەوەیە کە مانای وشەیەك بەیەك وشە ـرێ . ئەگەر وشەیەکی کوردی لە زمانی ڕووسیدا بەرانبەری وشەیەکی پڕ بە پێستی خۆی هەبێت و کە بە تەواوی مانای ئەو وشەیە بدات و ئەو وشەیەش وشەیەکی ئاسان و سادەو ساکار ـبێت ، ئەوە پێویست بە درێژە ناکات ...

وەرگێڕانی جزئی ئەوەیە کە وشەیەك یەك مانا لە ـمناکانی وشە فرەواتاکان ((polysemantic)) بدات ...

جگە لەو دوو جۆرە وەرگێڕانەی لە سەرەوە باسمان کرد ، هەروەها وەرگێڕانی کۆمەڵە وشەی هاوواتا ((synonym)) ـمورێکی گەورە و دیاری هەیە . زۆر جار بەرانبەر یەك وشەی کوردی لە زمانی ڕووسیدا چەند وشەیەك بەکار دەهێنرێن ئەمەش لە هەموو زمانێکدا هەیە) . جا بۆ لێکۆڵینەوەی مانای یەك وشەی کوردی بەکارهێنانی چەند وشەیەکی یەك هاوتای ـڕووسی نیشانەی دەوڵەمەندی و پوختی وەرگێڕانەو لەسەرێکی تریشەوە مانای وشە ئاسان دەکات .

هەروەها ڕێدەکەوێ بەرانبەر وشەیەکی کوردی لە ـزمانی ڕووسیدا دە ستەواژەیەك بەکار دەهێنرێ ، ئەمە جۆرە وەرگێڕانەش بایەخی خۆی هەیەو لە مەسەلەی زانستی وشەدا ((lexicology)) جێگای تایبەتی وەرگرتووە .

شەرحی وشە بەتایبەتی پێویستە لە کاتێکدا بەکاربهێنرێ کە لە زمانی ڕووسیدا وشەیەکی هاوواتا نەبێت بۆ دانی مانای وشەیەکی کوردی . هەروەها «فەرهەنگ نووس دەبێ گرنگی بدات بەوەی شەرحی وشەکان بە کورتی بکات ، بە مەرجێك ئەو کورتی‌یە نەبێ بەهۆی نەکردنەوەو ئاشکرا نەبوونی مانای وشەکان»[18] . جگە لەوە پێویستە شەرح کراوە بێت و بە وشەی ئاسان و سادە بێت .

یەکێ لە ئەرکە سەرەکییەکانی فەرهەنگی کوردی - ڕووسی ڕوونکردنەوەی مانای وشەیە . جگە لەوە نیشاندانی چۆنیەتی بەکارهێنانی وشەش شتێکی پێویستە لە کاری فەرهەنگ نووسیدا .

بێگومان بۆ تێگەیشتنی مانای هەندێ وشە ڕوونکردنەوە دەورێکی گرنگی هەیە . ئەمەش لە سەرێکەوە کاری خوێنەر ئاسان دەکاو لەسەرێکی تریشەوە شێوازێکی زانستی دەدات بە فەرهەنگەکە .

هەروەها پێویستە بەشێکی زۆری وشەکان بخرێنە ناو ڕستەیەکی کورت و ئاسانەوە ، تاکو مانای وشەکان باشتر ئاشکرا ببن و تا خوێنەر لەو ڕێگایەوە بزانێ چۆن ئەو وشانە لە ڕستەدا بەکار دەهێنرێن . جگە لەوە ل . ف . شێربا دەڵێ : بەینی وشەی زمانێك لەگەڵ زمانێکی تردا تەنها ئەوە نییە کە بەرانبەر یەکن و هاوواتان ، بەڵکو پەیوەندیی ئاڵۆزو جیاواز هەیە لە شێوەی بەکارهێنانیاندا[19] .

ئەگەر لەم ڕووانەوە تەماشای فەرهەنگی کوردی - ڕووسی ناوبراو بکەین ، دەبینین بەگشتی دانەرانی لە چۆنیەتی وەرگێڕان و لێکدانەوەی مانای وشەکانی فەرهەنگەکەیاندا لە هەمان کاتدا هونەرێکی بەرزیان نواندووەو بە زمانێکی ڕەوان و ئاسان ، بە وشەی بەرانبەری پڕ بە پێستی خۆی شەرحی وشەکانیان کردووەو مانایانیان لێکداوەتەوەو هەر وشەیەك چەند مانای هەبێت هەموو ماناکانیان بە ڕووسی نووسیوە ، بەمەو هەروەها بە هێنانەوەی گەلێك ئیدیۆم و پەندی پێشینان و قسەی نەستەق توانیویانە دەوڵەمەندیی زمانی کوردی نیشان بدەن . لە لایەکی ترەوە د . کوردۆ و د . زارێ زۆربەی وشەکانی فەرهەنگەکەیان خستۆتە ڕستەوەو وەریان گێڕاون بۆ ڕووسی و لەم ڕێگەیەوە تێگەیشتن و بەکارهێنانی وشەکانیان ئاسان کردووە ، خۆ ئەگەر وشەیەکی کوردی لە ڕووسیدا بەرانبەری نەبێ ، ئەوە بە شەرحێکی کورت و ئاشکرا مانای ئەو وشەیەیان داوە بە دەستەوە .

**ئنجا با تەماشایەکی هونەری ڕێك خستنی فەرهەنگەکە بکەین :**

**١ - ڕیزکردنی وشە کوردییەکان .**

بۆ ئەم جۆرە فەرهەنگە تاکە ڕێگای ڕیزکردنی وشە ئەوەیە کە بە گوێرەی ئەو زنجیرە ئەلفوبێیە بێت کە لە نووسینی کوردیدا هەیە . بەڵێ دانەرانی فەرهەنگی کوردی - ڕووسی ئەم ڕێگەیەیان گرتووەو بێگومان بۆیە خوێنەر لە دۆزینەوەی وشەدا

هیچ گیروگرفتێك نـایەتـە ڕێگای‌و بـە ئاسـانی ئەو وشـەیەی پێویستی بێ دەیدۆزێتەوە .

**٢ ـ وشەی هاوبێژ (homonym) .**

چۆن لەگشت زمانێکدا ، هەروەها لە زمانی کوردیدا وشە هەن کە بە خوێندنەوە نـووسین وەك یـەکن ، بەلام مـانایـان جیاوازە ، وەك :

**بیر ـ بیرو هۆش**

**بیر ـ (بئر ـ عەرەبی)**

**باو ـ دەستوور : فیسار شت بووە بە باو .**

**باو ـ باوك .**

**باو ـ زیادەی شتێك بەسەر شتێکی تردا .**

بێگومان ئەو چەند وشەیەی لە سەرەوە ناومان بردن لەو وشانە نین کە مانایان زۆرە ـ واتە وشەی فرەواتا ((polysemantic)) نین ، بەلکو ئەو وشانەن کە تەنها لە خوێندنەوەو نووسیندا وەك یەکن ، ئەگینا لە واتاو پەیدابوونیاندا جیاوازن ، وەك («بیر» ـ بیرو هۆش) کە وشەیەکی کوردییە زۆر دوورە لە («بیر» ـ بئر) کە وشەیەکی کوردی نییـەو لە پەیـدابوون‌و دروست بـووندا سەرچاوەیەکی تری هەیە . یاخود «باو» دەبینین سێ وشەن کە مانایـان جیاوازەو لەیـەك دوورن . هەرچـەندە هـەرسێکیان لەرەسەندا کوردین ، بەلام پەیدابوون‌و دروست بوونیـان لە ڕێگـای جیاوازەوە هـاتووە . جـا ئەم جـۆرە وشـانـە کـە لە لێکسیکـۆلۆژیدا وشـەی هاوبێـژ (homonym) یـان پێ دەڵێن ، پێـویستـە لەگـەڵ وشـەی فـرەواتـا (polysemantic) لەیـەك جیـابکرێنـەوەو تێکەڵ نـەکرێن‌و لە فـەرهەنگیشـدا وەك ئەو شێـوەیەی لە سـەرەوە نـووسـراون ـ واتـە بـە یـەك وشـە دانەنراون ـ تۆماربکرێت ... شایانی باسە ، کە د . کـوردۆو د . زاریێ لە ڕێکخستنی فەرهەنگەکەیـاندا لەسـەر ئەو ڕێگـا زانستی‌یە ڕۆیشتوون . ئەو ڕێگایەش ئەوەیـە کە ئـەو جۆرە وشانەی ناومان بردن بە یەك وشە دانەنراون‌و نـەخراونـەتە ڕیـزی ئەو وشـانەی کـە مانـایـان زۆرە (polysemantic)و جیـا کراونەتەوەو بە وشەی جیاوازو سەربەخۆی هاوبێژ (homonym) دانراون‌و سەرلەنوێ لە سەری دێڕ وەك وشەیەکی تایبـەتی نووسراون‌و ژمارەیان بۆ دانراوە .

**3 ـ وشەی فرەواتا (polysemantic) .**

لە زمانی کوردیشدا ، وەکو هەموو زمانەکـانی‌تر وشـە هەن کە تەنها مانایان هەیەو وشەش هەن کە مانایان زۆرە . بۆ نموونە دەبینین کە هەندێ وشە ، وەك : (شەو ، ئـاشەوان ، دراوسێ ، ئەژنۆ ... هتد) لە یەك مانا زیاتریـان نییە ، بـەلام وشەش هەن مانایان زۆرەو ئەو مانایانەش لە یـەك نێزیکن ، وەك :

**جۆش سەنـدن :(1) هاتنـە کوڵی شتی شـل لەسەر ئاگر ، (2) بریتی‌یە لە تاوسەندنی جیهانی لە هاونیدا ، (3) گەرم‌بوونی یەکێك لە کارێکدا .**

دانەرانی فەرهەنگی ناوبراو بۆ ئاسانکردنی بەکارهێنانی فەرهەنگەکەو کێشانی سنوور لە نێوان ماناکانی یـەك وشەدا باش ماناکانیان لەیەك جیاکردۆتەوە . ئەوانەی ئەم فەرهەنگە بەکار دەهێنن لەم ڕێگەیـەوە لە تێگەیشتنی مـانای وشـەدا تووشی هەڵەو زەحمەت نابن‌و ئەو زاتانەش کە فەرهەنگەکەیان دانـاوە ، جگـە لەوەی بـەم کـارە شێـوازێکی زانستی‌یـان بـەکارەکـەیان داوە ، هـەروەها هـەنـدێ کێشـەی زانستی وشەشیان چارکردووە .

**4 ـ وشەی هاوواتا (synonym) .**

بەو وشانە دەڵێن کە یەك مانا دەبەخشن یاخود مانایان لێك نزیکە ، بەلام لە خوێندنەوەو نووسینیاندا جیاوازن ، وەك : (لێڕ ـ دارستان ، جەنگەڵ ؛ ئاوارە ـ پـەڕیوە ـ دەربـەدەر ، ئـەوین ـ ئـەڤـین ـ دلداری ـ عیـشق ، تـووش ـ دژوار ـ سەخت ـ ناخۆش ... هتد) .

بێ گومان بۆ فەرهەنگی ناوبراو پێویست بە وەرگێڕان‌و لێکدانەوەو شەرحی هەموو ئەو وشانە ناکات ، بۆیە دانـەران مانای وشەی یەکەمیان (واتە ـ بەگوێرەی زنجیرەی ئەلفوبێی کوردی) یاخود هەرە ناسراویان داوەو لەبەردەم ئەوانی تردا نووسیویانە : بڕوانە فلان وشە . خۆ ئەگەر جیاوازییەکیش لە نێوانیاندا هەبێت دەست‌نیشانیان کردووە .

ئەم شێوەیە نەك هـەر ڕێگا کـورت دەکاتـەوە ، بەڵکـو نیشانی خوێنەریشی*دەدات کە «وەتەن»و «نیشتمان» ، «ئەوین» و «ئەڤین» و «عیشق» و «دلداری» ، «خاپوور» و «وێران» .. هتد خاوەنی یەك مانان . هەروەها بـەمەش یـەکێك لەکێشـەکانی زانستی وشە خاوکراوەتەوە .

**5 ـ هـەندێ نیشـانە بـۆ ئـاسـانکـردنی کـاری چـاپ‌و سووك‌کردنی باری فەرهەنگەکە :**

بـۆ ئاسـانکردنی کـاری چـاپ‌و سـووك‌کـردنی بـاری فەرهەنگەکەو خوێنەران چەند نیشانەیەکیان بەکارهێناوە . بە

وێنە :

ـ لەکاتی خستنە ڕستەی وشەیەکدا بۆ دووپات کردنەوەی وشەکە هێڵێك بەم جۆرە (ـــ) کێشراوە ، وەك :

**(دڵ) ـــ م پێ سووتا**

**ئەو پیاوێکی بە ـــ ە**

**(کلر) ـــ لە ـــ ترازان**

ب - زۆر جار بۆ ڕوونکردنەوەی وشەیەك لە نێوان دوو کەواندا نووسیویانە کە ئەو وشەیە سەر بە چی پۆلە وشەیەکە ، وەك :

ناو ، جێناو ، کردار (تێپەڕ ، تێنەپەڕ ...) ... ، نەبات ... پزیشکی ... قسەی نەستەق ... هتد . بۆ تەواو ئاسانکردنی ئەم مەبەستە پیتێکیان کردووە بە نیشانەو لە پێشەکی فەرهەنگەکەدا باسیان کردووە .

**حـ - بۆ جیاکردنەوەی وشەو فریزی بەرەڵلا[17] لە ئیدیۆم و دیاریکردنی ئیدیۆم ، لە بەردەم هەر ئیدیۆمێکدا ئەم نیشانەیە ■ یان داناوە :**

... و گەلێکی تر .

بێگومان ئەم شێوازە ڕێی کورت کردووەتەوەو باری چاپی ئاسان کردووەو هەر لەبەر ئەوەشە کە لە تێکڕای فەرهەنگی وڵاتە پێشکەوتووەکاندا پەیڕەوی دەکرێ .

هەروەها د . کوردۆ لە بیست لاپەڕەی کۆتایی فەرهەنگەکەدا هەندێ جەدوەلی بۆ گەردانی ڕیژەی جۆر بەجۆری کردار ڕێکخستووەو ئەم بەشەش بە تەواوی بە فەرهەنگەکە خۆیەوە بەستراوەو کەڵکی زۆرە بۆ بەکارهێنانیو بۆ فێربوونی زمانی کوردی .

سەرەڕای ئەمانە هەموو گەلێك ڕووی تری گرنگ لە فەرهەنگەکەی د . کوردۆ و د . زاریدا بەدی دەکرێ ، هەرچەندە ئەمەش وا ناگەیەنێ کە ئەو فەرهەنگە کەموکورتی تێدا نییە ، بەڵام ئەوەندە هەیە کەموکورتێکانی لە نرخی بەرزی کەم ناکەنەوە ، بەتایبەتی ئەگەر بێتوو ئەوەش لە یاد نەکەین کەوا دانەرانی سوودیان لە تەجروبەی فەرهەنگنووسانی کوردو ئەوروپا وەرگرتووەو ئەمەش بووە بە هۆی سەرکەوتنی فەرهەنگەکەو بە هۆی نووسینی لەسەر شێوازێکی زانستی . بەم جۆرە ئەم فەرهەنگە بە یەکێك لە فەرهەنگە بەرزەکانی کوردی دەژمێررێت و بەرهەمێکی گەورەی زانستی یە لە کاری کوردناسیی سۆڤێتدا .

## پەراوێزەکان :

(1) د . قەناتی کوردۆو د . زاری یوسف ، فەرهەنگی کوردی ڕووسی (سۆرانی) ، مۆسکۆ ، 1983 .

(2) بۆ وەرگرتنی زانیاری لە بارەی ئەو فەرهەنگانەوە ، بڕوانە : د . ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، وشەی زمانی کوردی ، بەغدا ، 1975 ، ل 91 — 96 .

(3) د . قەناتی کوردۆ ، فەرهەنگی کوردی ـ ڕووسی (کرمانجیی ژووروو) ، مۆسکۆ ، 1960 .

(4) هەمان سەرچاوە ، ل 5 — 14 (بە ڕووسی) ، ل 15 — 24 (بە کوردی) .

(5) د . ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، مێژووی فەرهەنگنووسیی کوردیو شێوازی دانانی فەرهەنگی ڕووسی ـ کوردی ، لێنینگراد ، 1973 ، ل 16 — 99 (نامەی دوکتۆری ، بە زمانی ڕووسی) .

(6) شێخ محەمەدی خاڵ ، فەرهەنگی خاڵ ، سلێمانی ، ب 1 ، 1960 ، ب 2 ، 1964 ، ب 3 ، 1976 .

(7) گیو موکریانی ، «مەهاباد» ، فەرهەنگێکی قوتابخانەیی کوردیو عەرەبییە ، هەولێر ، 1961 .

(8) گیو موکریانی ، «کوڵکەزێڕینە» ، کوردی ـ فارسی ـ عەرەبی ـ فەرەنسی ـ ئینگلیزی ، هەولێر ، چاپی یەکەم ، 1955 ، چاپی دووەم ، 1966 .

(9) عەلائەددین سەجادی ، دەستوور وە فەرهەنگی زمانی کوردی ـ عەرەبی ـ فارسی ، بەغدا ، 1962 .

(10) Taufiq Wahby and C.J. Edmonds, A Kurdish — English. dictionary, London, 1966.

(11) مەعرووف قەرەداغی ، فەرهەنگی کشتو کاڵ ، ب 1 — 2 ، بەغدا ، 1972 — 1973 .

(12) عەبدولڕەحمان محەمەد ئەمین زەبیحی ، قامووسی زمانی کوردی ، بەرگی یەکەم ، بەغدا ، 1977 .

(13) ل . ڤ . شێربا ، تیۆریی فەرهەنگنووسی ، مۆسکۆ ، 1940 ، ل 106 (بە زمانی ڕووسی) .

(14) ئا . ڤ . فیۆدوروڤ ، تیۆریی وەرگێڕان ، مۆسکۆ ، 1960 ، ل 5 — 6 (بە زمانی ڕووسی) .

(15) ئا . ك . باروڤکوڤ ، لە تەجروبەی فەرهەنگ دانانـدا ، «گۆڤاری فەرهەنگنووسی» ، مۆسکۆ 1957 ، ل 140 ، (بە زمانی ڕووسی) .

(16) سەرچاوەی ناوبراو ، ل . ڤ . شێربا .

(17) بۆ وەرگرتنی زانیاری سەبارەت بە فریزی بەرەڵلا ، بڕوانە : د . ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، وشەی زمانی کوردی ، بەغدا ، 1975 ، ل 56 — 60 .

# زانیاری یان زانستی
# پیت یان تیپ



**حەسەنی شێخ حمە مارف**



کۆبوونەوەیێکمان کرد = کۆبوونەوەیێکیان کرد یان کۆ بووینەوە = کۆبوونەوە .

١ - ووشەی زانیاری لە دوو بەش پێك هاتووە یەکەم زانین دووەم یار بەوێنە کریار ، فرۆشیار ، بەختیار ئەگەر ئێمە چاك سەرنج بدەینە ووشەی زانیاری بۆمان دەرئەکەوێ کەسەرچاوەکەی زانینە ، وە ووشەی زانیاری ماناکەی بەم جۆرەیە ! زانیار یانی زانین یاریەتی یاخود زانینی لەگەلایە وەبەمانایەکی چاکتر واتا زانین هاوڕێیەتی ، یاخودزانین ئاوەڵێتی ، وەلەم لێکۆڵینەوەیەدا بە تەواوی بۆمان ئاشکرا ئەبێ و دەرئەکەوێ کە زانیاری مانای (معلومات)ە عەرەبی یەکە پڕ بە پێستێتی ، وە ووشەی زانیار مامۆستای ووشەوانی زمانی‌کوردی بەڕێز توفیق‌وەهبی دروستی کردووەو لەکاتی خۆیا ئێمە لە گۆڤاری دەنگی گێتی‌ی تازەو گۆڤاری پێشکەوتنا بڵاومان کردۆتەوە . وەلەزمانی کوردیدا واتا لە ئاویستادا کە سەرچاوەی زمانی کوردی‌یە ووشەیێکی ترمان هەیە کە مانای تەواوی (علمی)ی عەرەبی ئەبەخشێ کە ئەویش ووشەی زانستی‌یەو پڕ بەپێستی ووشەی علمی عەرەبی‌یە .

وەتەنانەت ئەم ووشەی زانستی‌یە لە ناو نەخوێندەوارو لادێ‌کان زۆر بەکار ئەهێنرێ ، ئەگەر چاك لێ‌ی وورد بینەوە پڕ بە پێستی ووشەی علمی‌یە چونکە ئەگەر کۆمەلێك بیانەوێ ئیشێکی گرنگ بکەن ، یان شتێکی گرنگ دروست بکەن لە راوێژی قسەکانیانا ئەلێن برا : ئەم ئیشە زانستی ئەوێ هەروەها ئەلێن پێویستە ئەم ئیشە بەزانست و معرفەت بکرێ . کەوابوو لەم لێکۆڵینەوەیەدا بەچاکی بۆمان دەرئەکەوێ کە ووشەی زانستی یانی معرفەت پڕ بە پێستی ووشەی (علمی یان

حـرف ه ئیمه که ووشه‌یه‌کی کۆنی کوردی‌ی چاك‌و پاراومان ...و مانای ووشه‌ی (علمی یان معارف) عه‌ره‌بی ئیتر بۆچی ...ـه ووشه‌ی زانیاری نه‌بینه‌وه‌و هه‌میشه له‌نووسینه‌کانمانا ...ی ووشه‌ی علمی به‌کاری نه‌هێنین .

... ووشه‌ی (پیت) لام وایه زۆر له نووسه‌ران‌و خوێنده‌وارانی ...ـه کاتی گفتو گۆ کردنا له‌گه‌ڵ یه‌کدا بـه‌تایبـه‌تی له‌گه‌ڵ ...ـیشتوانی لادێ‌کاندا زۆر جار ووشه‌ی (پیت) یان هاتبێته به‌ر ...ی که ووتوویانه ئه‌م زه‌ویه زۆر به‌پیت‌و به‌ره‌که‌ته تاڵـانه‌ت ...ـه ووشه‌ی پیتا ووشه‌ی به‌ره‌که‌ته‌که‌شیان به‌کارهێناوه ، ...ر که‌س ده‌ستی به‌پیته ، به‌خواپیتی برد به‌حه‌وادا یان زۆر ...ر گوێم لێ بووه که ئافره‌ت له ناو خۆیانا ووتوویانـه ده‌ستی ...ـه مالا پیتی زه‌خیره نـاهێڵێ . کـه‌وابوو له‌مـه‌وه بۆمـان ...ـه‌رنه‌که‌وێ که ووشه‌ی پیت پڕ به پێستی ووشه‌ی به‌ره‌که‌تی عه‌ره‌بی‌یه . هه‌رله‌م بابه‌ته‌وه چه‌ند ووشه‌یه‌کی تر ئه‌بیستین که ...و یـان سێ ووشه‌ن‌و بـه‌یه‌ك ده‌م (تلفـظ) ئه‌ووتـرێن‌و یه‌ك ...شیان هه‌یه . وه‌کو ئه‌ڵێن گوێ قولاخ ئه‌مه دوو ووشه‌یه گوێ قولاخ به‌تورکی هه‌ندێك له ده‌ف لێده‌ره‌کان ئه‌ڵێن له‌سه‌ر به‌ردی سـه‌نگی سه‌خرێ ئه‌مه‌ئه‌توانین پێ بلێـین ڕسته چـونکه له‌سێ ووشه پێك هاتووه‌و هه‌ر سێکیشیان یه‌ك مانایان هه‌یه :

به‌رد به‌کوردی سه‌نگ به فارسی ، صخر بـه عه‌ره‌بی .

وه‌ئه‌م ڕوون کردنه‌وه‌یه‌دا به‌ته‌واوی بۆمان ئاشکرا ئه‌بێ کـه ووشه‌ی (پیت) به‌مانای به‌ره‌که‌ت نه‌ك به‌مانای (حه‌رفه) کـه وه‌کـو زۆر که‌س له‌نـووسه‌ران‌و خـوێنده‌وارانی بـه‌ڕێز تێ‌ی گه‌یشتوون‌و هه‌ر به حه‌رف ئه‌ی دانه قه‌ڵه‌م . به‌ڵام به‌داخه‌وه ووشه‌ی (تیپ) که له زمانه ئـاریه‌کـانی‌تره‌وه نـزیکه‌و قـاڵبی ووشه‌ی (حه‌رفه) خراوه‌ته پشت گوێ ئه‌ی بۆچی ووشه‌ی تیپ یان تایپ بۆ ووشه‌یه‌کی سپایی به‌کاری ئه‌هێنن‌و سه‌پاندوتانه به‌سه‌ر سپادا ، وه‌بۆ ناوی کۆمه‌ڵێك سه‌رباز ئه‌ی داته قه‌ڵه‌م وه‌کو ناوی (فوج) یان (فرقه) به پێ‌ی سنووری زانیاری‌و ڕای خۆم (تیپ) ووشه‌یـه‌که پـڕ به پێستی (حـرفه) وه‌هـه‌ر له‌به‌ر ئه‌وه‌ش کاتی خۆی به‌سه‌ر ناوی کۆمه‌ڵێ له سه‌ربازا سه‌پێنراوه چونکه نووسین (تیب یان حرفـ) ی هه‌موو زمانێك به‌ڕیزو یه‌ك له‌دوای یه‌که‌و به‌ڕیز ئه‌نووسرێن‌و ئه‌خـوێنرێتـه‌وه بۆیـه ئه‌م ناوه‌شی لێنراوه .

وه‌به‌ڵگه‌شم بۆ (تیپ) که پێویسته بـه (حرف) دابنـرێ ئه‌وه‌یه ووشه‌ی تیپ یان تایپ له زمانی ئینگلیزیدا هه‌یه وه‌کو ئه‌ووترێ (تایپ ڕایته‌ر) یانی حه‌رف نووس . وه‌هیچ گومان نیه له‌وه‌دا که‌زمانی کوردی زمانێکی ئاری‌یه زۆر ووشه‌ی کوردی وه ووشه‌ی زمانه ئاری‌یه‌کان وه‌کو یه‌ك وانه ته‌نانه‌ت له تلفظیش جیـاوازی‌یان زۆر کـه‌مه یـان زۆر له‌یـه‌ك ئـه‌چن . وه‌کـو له ئینگلیزیدا ووشه‌ی (براذه‌ر به‌کوردی براده‌ر)(بازار به کوردی بازاڕ) (کارڤـان به کـوردی کاروان) (لیـك به کـوردی لاق) . هه‌روه‌ها له فره‌نسیدا ووشه‌ی (برو به کوردی بـرۆ)(ژنۆ بـه کوردی ئه‌ژنۆ)(کورت به کوردی کورت) . وه‌ڕای مامـۆستای ووشه‌وانی کوردی به‌ڕێز (توفیق وه‌هبی)ش ئه‌وه‌یه که‌له‌باتی حرف ووشه‌ی تیپ به‌کار بهێنرێ نه‌ك ووشه‌ی پیت .

وه‌زۆر جاریش لێم بیستووه که ئه‌ی ووت زمانی گورگه که له هیندستانایه‌و زمانی پۆلۆنی له‌ئـه‌وروپادا زۆر ووشـه‌یانی له‌یـه‌ك ئه‌چێ . له‌ئـه‌نجامـدا هیواو تکـام وایـه کـه‌له‌مـه‌ولا نـووسه‌ران‌و خـوێنده‌وارانی بـه‌ڕێز ووشـه‌ی پیت بۆ مـانای به‌ره‌که‌تی عه‌ره‌بی ، وه‌ووشه‌ی تیپ بۆمانای حه‌رف به‌کاربێنن چونکه وه‌کو بۆم به‌یان کردن هه‌ریه‌که له‌و دوو ووشه‌یه مانای تـه‌واوی خۆیـان هه‌یـه‌و پڕ بـه‌پێستیانـه ئه‌مـه‌وێ ئـه‌وه‌ش بخه‌مه‌به‌رچاوی نووسه‌ران‌و خوێنده‌واران کـه‌هه‌نـدێ که‌س ڕایان وایه ووشه‌ی (فه‌ڕ) به‌مانای به‌ره‌که‌تی عه‌ره‌بی‌یه به‌ڵام ڕای من پێچه‌وانه‌ی ئه‌وانه‌وه‌یه چونکه (فه‌ڕ) به‌مانای (خێر) ی عه‌ره‌بی‌یه نه‌ك به‌مانای به‌ره‌که‌ت به‌وێنه : دووکه‌س له‌شێوه‌ی گاڵته‌و گه‌پدا یان له‌شێوه‌ی گله‌ییدا یه‌کێکیان به‌وی تریان ئه‌ڵێ به‌خوا بێ فه‌ڕی یان ئه‌ڵێ بڕۆ بێ‌فه‌ڕ ئه‌مه ئاشکرای ئه‌کا که فه‌ڕ مانای خێری عه‌ره‌بی یه‌و پڕ به‌پێستی نه‌ك به‌مانا به‌ره‌کـه‌ت ته‌نیا له یه‌ك قسه‌دا نه‌بێ که ئه‌ووترێ فه‌ڕو به‌ره‌که‌تت هاوورد ئه‌مه‌ش چاك لێ‌ی وورد بێته‌وه ئه‌وفه‌ڕه له‌م قسه‌یه‌دا مـانای ئه‌وه‌یه خێرت هێناوه که مانای چاکه‌یه وه‌هه‌رگیز نـه‌ووتراوه‌و ناووترێ ئه‌م زه‌ویه به‌فه‌ڕه . ئیتر له‌مه‌شا تکاو هیوام وایه که نووسه‌رانی به‌ڕێز له‌مه‌ولا ووشه‌ی فه‌ڕ به‌مانای ته‌واوی خۆی که (خێر = چاکه) یه‌بنووسن‌و بی‌ده‌نه قه‌ڵه‌م .

براندنەوەی نێچیرەکانی .. بەڵام کە گەیشتە نێو کۆڵانی تەنگەبەرو بەپەناوپێچی ئەو گەڕەکە کۆنە .. پتر هەنگاوەکانی قورس بوون و لەسەرخۆو هێدی ملی دەنا .

ئاغای ـ وەرەم ـ ئەوەندە پیاوانەو بەغیرەت و مەرد نەبوو .. ئافرەتێکی وا وردو چکۆلانەو بێگیانی وەك جۆنسی ـ یش کە بە ئاووهەوای کالیفۆرنیا ڕاهاتبوو بۆ میوانێکی دەست ڕەش و هەناسەسوارو گەلحۆی وەك (وەرەم) گەمەیەکی زۆر سادەو سانا بوو .. هات و دەستی خۆی لە جۆنسی وەشاندو یەكتەختە خستی یە نێو پێخەف .. لەسەر قەرەوێلەیەکی بۆیەکراو ڕاکشا ، مەگەر بەحاڵ ، ئەگینا جووڵەی بۆ نەدەکرد .. لە پەنجەرەیەکی هۆلەندیانەی چکۆلانەوە هەمیشە سەیری دیوارێکی ڕووتی ئەوبەری دەکرد .. دیواری ئەو خانووەی کە کەوتبووە بەرامبەری پەنجەرەکە .

بەیانیکیان پزیشکێکی سەرقاڵ و برۆ چڕو تۆزاوی هات و پاشان (سوو) ی بردە هەیوانەکەو پێی وت :

« هیوای مانەوەی ئەم کچە ـ دەتوانین بڵێین ـ لە [ دە ] یا یەکە ! » ئەمەی وت و تەرمۆمەترەکەی ڕاوەشاند تا جیوەکە بنیشێ : « ئەم هیوایەش بەوەوە دەبێ گەر خۆی دڵی بە دونیا خۆش بێت و بیەوێ بژی . مەسەلەی هاودەنگی نێوان خەڵکیش وا دەکا تەقەڵلای دونیای دەرمانسازی ببێ بە گاڵتەو فشقیاتێکی تەواو .. ئەوەو چاودێریش لەوێ بوەستێ . بەس لەوە دەچێ ئەم خانمە چکۆلانەی دۆستی تۆ بڕیاری کۆتایی خۆی دابێ کە ئیتر بۆی نی یە چاك بێتەوە . پێم بڵێ .. ئاخۆ ئەم کچە چی لە مێشکدا هەیە ؟ »

(سوو) وەڵامی دایەوەو وتی :

« ئەم ـ ئەم .. تەنها ئاواتێکی ئەوەبووە ڕۆژێ لە ڕۆژان ڕەسمێکی ـ نۆکەندی ناپلس ـ بکاو بەس . »

« ڕەسم ؟ ـ قسەی قۆڕ ! چ شتێك هەیە کە بەڕاستی خەیاڵی ئەم کچەی تێکدابێ و .. ئەوە بهێنی کە بیری لێبکاتەوە ـ پیاوێ بۆ نموونە ؟ »

« پیاو ؟ » ـ سوو ـ ئەمەی وت و لەرەی دەنگی وەك مۆسیقای گیتاری ـ جوولەکە ـ زرنگایەوە . « پیاو ئەوە دەهێنێ ـ بەڵام ، نەخێر ، دکتۆ هەرگیز شتی وا لە ئارادا نی یە . »

دکتۆرەکەش پێی وت : « ئێ .. کەواتە حاڵەتێکی بێهێزی و لاوازی یە .. من چی زانستی هەمەو ئەوەندەی لە تواناندا بێ دریغی ناکەم . بەڵام ئەگەر نەخۆشەکەم پێشبینی پرسەی خۆی بکاو هیوای بە ژیان نەمێنێ .. دەتوانم بڵێم تواناو کاری دەرمان و دەرمانساز لە ـ سەدا/پەنجا ـ کورتی دێنێ . ئەگەر بتوانی وای لێ بکەی لە جل وبەرگ و پاڵتۆی زستانی ئەمساڵ بپرسێ ... ئەوە من بەڵێنی تەواوت دەدەمێ کە نەك (یەك وده) بەڵکو (یەك و پێنج) هیوای ساغ بوونەوەیمان دەبێ و ئەم دەردەی لە کۆڵ دەبێتەوە . »

دوای ئەوەی پزیشکەکە ڕۆیشت .. سوو چووە ژووری ستۆدیۆکەو دایە پرمەی گریان . پاشان بۆردی ڕەسمەکەی هەڵگرت و رووەو ژوورەکەی ـ جۆنسی ـ خشی و هەر بە فیکەلێدان کەوتە سەرمەستی ئاوازێکی ڕەسەنی قولەرەشەکان .

جۆنسی نەخۆش ڕاکشابوو .. لەژێر پێخەفەکەیدا نەدەبزوت ، ڕووبەڕووی پەنجەرەکە لێی پاڵکەوتبوو . (سوو) لە فیکەلێدان کەوت .. چونکە وای هەست کرد جۆنسی خەوی لێکەوتووە .

بۆردەکەی ئامادەکردو هەر بەقەڵەمی مەرەکەب چەند سکێجێکی بۆ گۆڤارێکی چیرۆکان ڕەسم کرد . ئەوەیە : هونەرمەندە لاوەکان هەمیشە ڕەسم بۆ گۆڤاری چیرۆکان دەکەن تا دەروازەی دونیای مەزنی هونەریان لێبکرێتەوە .. هەروەك چۆن نووسەرە گەنجەکانیش دەنووسن تا ڕێ بۆ دونیای ئەدەب خۆش بکەن .

لەو ساتەی کە ـ سوو ـ سکێجی کاوبۆیەکی ـ ئیداهۆ ـ ی دەکرد .. دەیویست پانتۆڵێکی جوان و چاوێلکەیەکی یەك شووشەیی بۆ ڕەسمەکە زیاد بکا کە بۆ خۆپیشاندانی سوارئەسپان بشێ و بەردل بێ ... ئا لەم ساتەدا چەند ورتەورتێکی نزمی بیست کە چەند جارێك هاتەوە بەرگوێی . خێرا هەنگاوی ناو گەیشتە کن پێخەفی جۆنسی .

چاوەکانی ـ جۆنسی ـ تا ئەوپەڕی زەق ببوونەوە . لە

پەنجەرەکەوە دەیڕوانییە دەرێو کەوتبووە ژماردن ـ ژماردنێکی ئاوەژوو .

ورتەیەکی لێوەهاتو وتی « دوانزە .. » دوای تۆزێکی دیکە وتی « یانزە .. » پاشان « دە » و « نۆ » .. دوایی « هەشت »و « حەوت » هەرلەدوای یەك ئەم دوو ژمارەی لە دەم هاتەدەر .

ـ سوو ـ لە پەنجەرەکەوەرا پەرۆشانە سەیرێکی دەرەوەی کرد . چی هەیە تا بیژمێرێ ؟ لە گۆرەپانێکی چۆڵو ڕووتو ماتو مردوو واوەتر هیچ دیار نی یە . لەولاتریش لە دووری بیست پێوە لادیواری ڕووتی خانوویەکی خشتەو هیچیتر . بەلام تا ناوەڕاستی دیوارەکە بنەمێوێکی پیرو گرنجگرنج وەك لاولاو هەڵکشابوو .. بنەمێوێك کە لە ڕەگەوە تەواو ڕزیوو کرمێ ببوو . هەناسەی ساردی پایزیش هێدیهێدی گەلاکانی هەڵدەوەراند تا وای لێهات لقەکانی وەك ئێسقان ڕووتو قووت شۆڕ ببوونەوە .. بەڕووی خشتە داڕووخاوەکانیشەوە نیشتبوون .

« ڕۆحەکەم .. ئەوە چیتە ؟ » سوو لێی پرسی .

« شەش .. » هەر بەچرپە جۆنسی ئەم ژمارەی لە زار هاتە دەر . « ئێستاش وا خێراتر هەڵدەوەرێن .. خێرا دەکەون . سێ ڕۆژ لەمەوبەر سەدەهای پێوە مابوووەو نەمدەتوانی بیانژمێرمو سەرم ژانی دەکرد . بەلام ئەوەتانێ ئێستا ژماردنیان گەلێ ئاسانە . ئەوەتە ... ئەوە یەکێکی دیکەشیان هەڵوەری . ئێستا تەنها پێنج دانەی پێوە ماوەو بەس . »

« گیانەکەم .. پێنجی چی .. دە بە ـ سوودی ـ یەکەی خۆت بڵێ . »

« گەلاکان . گەلاکانی ئەو بنەمێوە . هەر کاتێ دوا گەلای لێهەڵوەرێ .. ئەوسا منیش دەبێ بمرم . ئەوە سێ ڕۆژە من ئەم ڕاستی یە دەزانم . ئەی دکتۆرەکە پێی نەوتی »

« ئۆه .. من هەرگیز قسەی وا پروپووچم نەبیستووە . » سوو ئەم وەلامەی بە زمانێکی وا دایەوە کە ئەوپەڕی گلەیی و تووڕەیی و گاڵتە بنوێنێ ئاخر گەلای بنەمێوێکی پیرو ڕزیو چ پەیوەندی یەکی بە چاكبوونەوەی تۆ هەیە ؟ تۆ هەمیشە ئەم بنەمێوەت خۆشویستوە .. زۆریشت خۆشویستووە .. تۆ خووت خەراپ بووە. بەسەو خۆت گێل مەکە . ئەم بەیانی یە دکتۆرەکە خۆی پێی وتم کە تۆ بێشك چاك دەبیتەوە ـ با بەڕاستی پێت بڵێم چی وت ـ ئا .. وتی : (یەكودە) فەرقت کردووە ! .. ئەوەیان زۆر دەگەیەنێ هیوایەکی گەورەمان دەخاتە دڵ .. مرۆڤ کە لە شارێکی وەك ـ نیویۆرك ـ بژیو ناچار بێت سواری ئەم هەموو تراموو ئوتمبێلە بێتو یان بەتەنیشت ئەو باڵەخانەو خانووە زۆرانە گوزەر بکا کە تازە دروست دەکرێن : دەبێ هەر بەقەد تۆ هیوای بە ژیان بێ ! ئێستا هەندێ شۆربات بۆ دێنم بیخۆی .. واز بێنە تا بچمەوە سەر ڕەسمو سکێچەکانم .. بەڵکو شتێکم لە سەرنووسەری گۆڤارەکە چنگ بکەوێو شەرابێکی پورتوگالی بۆ ئەم منالە نەخۆشەم بکرمو لەگەڵ چەند کوتە گۆشتێکی بەراز بۆ خۆمی نەوسنو چلێس . »

« نا .. ئیتر پێویست بە شەراب ناکا .. مەیهێنەوە . » جۆنسی ئەمەی وتو چاوەکانیشی بەسەر پەنجەرەکەوە ڕوا بوون .. سەیری دەرەوەی دەکرد . « ئەوەتانێ گەلایەکی دیکەش کەوتە خوارێ . نەخێر .. وازبێنەو شۆرباکەشم ناوێ . ئەوەتانێ .. تەنها چوار گەلا ماونەتەوە . بەرلەوەی تاریك دابێ .. حەز دەکەم بەچاوی خۆم دوا گەلای ببینم کە هەڵدەوەرێ . ئەوسا منیش دەمرمو ... ماڵئاوا . »

ـ سوو ـ بەسەریا نوشتایەوەو پێیوت : « جۆنسی .. گیانەکەم .. بەڵێنی ئەوەم دەدەیتێ کە چاوەکانت بنوقێنیو لەم پەنجەرەیەوە چیتر سەیری دەرەوە نەکەی تا من لەم ڕەسمانە تەواو دەبم ؟ ئاخر بەیانی دەبێ ئەم سکێچانە بگەیەنم بەدەستی خاوەنەکەی . بەقوربان پێویستم بە ڕووناکی هەیە ، ئەگینا وام لێدەکەی پەردەکە دابدەمەوە . » کەچی بەوپەڕی ساردی یەوە جۆنسی لێی پرسی : « ناتوانی لە ژوورەکەی دیکە ئەم ڕەسمانە بکەی ؟ »

« ئاخر من حەز دەکەم لای تۆ بمێنمەوە .. لەگەڵ ئەوەشدا حەز ناکەم بەردەوام سەیری ئەم گەلا هیچانە بکەی . »

جۆنسی چاوەکانی داخست .. سستوبێگیان .. ڕەنگی سپی هەڵگەڕابوو .. هەر دەتوت پەیکەرێکەو لەسەر قەرەوێلەکە کەوتووە .. پاشان وتی :

« کە تەواو بووی .. زوو پێم بڵێ .. چونکە حەز دەکەم دوا گەلای ببینم چۆن دەکەوێ . من .. چاوەڕوانی یەکی

خستووم . لێکدانەوە ماندووی کردووم . دەمەوێ دەست لە هەموو شتێ بشۆم .. ون بم‌و نەمێنم .. وەك یەکێ لەم گەلا بێ دەستەلات‌و ماندووانە هەڵوەریم‌و بمرم .. سەرنگوم بم »

سوو ـ ش پێی وتەوە : « هەولدە بخەوی .. دەبێ بچم‌و پیرە (بێرمان) بانگی سەرەوە بکەم تا ببێ بە مۆدێلی ئەو بیرە کانچی‌یەی دەمەوێ وێنەی بکێشم . لە دەقیقەیەك پترم بێ‌ناچێ . نەجوڵێیتەوە تا دیمەوە . »

پیرە ـ بێرمان ـ ی هونەرمەند لە ژوورەکەی خوارەوە دەژیا کە کەوتبووە ژێر ستۆدێوکەی ئەو دوو کچە . تەمەنی لە شەست ساڵ بەسەرەوە تریش بوو .. ریشێکی پڕو لوول کە لەگەڵ سەروپرچی تێکەڵ ببوون .. ریشێك کە کت‌ومت لە ریشی پەیکەرەکەی مووسا پێغمبەری ـ مایکل ئەنجیلۆ ـ ی دەکرد .. ئەو مووە زۆرە قەف‌قەف بە کەللەسەریکەوە نووسابوو کە نمونەی شەهوەت‌و هەوەسبازی‌و بەرەڵلایی‌و دەم‌شڕ بێ‌و بە بەژن‌و باڵایەکدا دەهاتەخوار کە کت‌ومت هی عفریتێکی چکۆلانەی زیانبەخش‌و گاڵتەجاڕ بێ . بێرمان لە دونیای هونەردا بێ‌ئومێدو شکەستەباڵ مابووەو هەمیشە نوشوستی دەهێنا . چل ساڵی ڕەبەق دەست‌و فلچەی شەڕیان بووە بێ‌ئەوەی توانیبێتی هیچ بەهیچ بکا . هەمیشە خەونی بەوەوە دەدی کە ڕۆژێ لە ڕۆژان شاکارە مەزنەکەی خۆی پێش‌کەشی ئەو خەڵکە دەکا ، بەلام لەگەڵ ئەو خەونە گەورەیەش هەرگیز قەڵەمی بۆ نەخستبووە سەر کاغەز . بەدرێژایی ساڵانێکی دوورو درێژ ، هەر ساتە نا ساتێ ، چەند ڕەسمێکی زەیتی شڕو شێواوی بۆ ئارەزووی بازرگان‌و پڕۆپاگەندەناسەکان دەکردو .. بەوەش نانی دەمی خۆی مسۆگەر دەکرد . جارجارەش دەبوو بە مۆدێلی ئەو هونەرمەندە لاوانەی گەڕەکەکەو لە بەرامبەریان دادەنیشت‌و ئەوانیش پارەیەکی کەمیان دەخستە دەستی پیرە ـ بێرمان ـ .. چونکە هەرگیز نەیان‌دەتوانی پارەیەکی وا زۆر بدەن بەو کەسانەی مەسەلەی ـ بوون‌بە مۆدێل ـ ببووە پیشەیان . زۆر بەبێ‌تامیش پێکە (جن) ی هەڵدەداو لە شاکارە مەزنەکەی داهاتووی خۆی دەدوا کە ڕۆژێ لە ڕۆژان هەر ڕەسمی دەکا . بەلام خوا هەڵناگرێ پیرەمێردێکی چکۆلانەو ئازاو بەجەرگ بوو ، هەر کەسێکیش شانازی بە ناسکی خۆیەوە بکردبا .. ئەم زۆر بەتوندی‌و دڵڕەقانە گاڵتەی پێ‌دەکردو فشەی پێ‌دەهات .. خۆی کردبووە پاسەوانێکی بێدارو وریای ئەو دوو شۆخە هونەرمەندەی کە لە ستۆدێوکەی سەرەوە دەژیان .. هەمیشە وەك سەگی شوانان دەیانی‌پاراست .

ـ سوو ـ بەنیازی دیتنی پیرە ـ بێرمان ـ چووە خواری‌و سەری بە کولانەکە داگرت .. ئەوەندە ڕووناك نەبوو بەرچاوی خۆی ببینێ .. بۆنی (جن) و توتڕکی لێوە دەهات . لە قوژبنێکی ستۆدێوکەدا کانڤاسێکی سپی‌و پاك بەسەر سێ‌پایەیەکەوە دیار بوو .. ئەو کانڤاسە سپی‌یەی سەر ئەو سێ‌پایەی کە بۆماوەی بیست‌وپێنج ساڵی ڕەبەق چاوەڕوانی یەکەم هێڵی شاکارە مەزنەکەی پیرەبێرمان بوو .. هەر لەوێ بێ‌دەستکاری مابۆوە .. چاوەڕوانی دەست‌وفلچەی بێرمان‌ی دەکرد .. (سوو) خەیاڵە سەیرەکەی جۆنسی بۆ پیرەمێرد گێڕایەوە .. کە چەندە دەترسێ‌و چەندیش سیس‌و باریك‌و بنێس بووەو لەوە زەندەقی چووە وەك گەلای زەردی پایز سووك هەڵوەرێ .. ئەوەندەش بێ‌هیوا بووە تۆزقاڵێ دڵی بەدونیا خۆش نی‌یە .. خەریکە دەست لە هەموو شتێ بەرداو بمرێ .

چاوەکانی پیرە بێرمان سوور هەڵگەڕان‌و پڕبوون لە ئاو ، بەوپەڕی نارەزایی‌و گاڵتەوە دەنگی هەڵبڕی‌و فشەی بەم خەیاڵە پووچە دەهات :

« هێ ... چی ! لەم دونیایەدا خەڵکێکی ئەوەندە ساویلکەو گێل هەن کە بە کەوتنی گەلای پیرە مێوێکی لەعنەتی دڵیان دابخورپێ‌و وای بۆ بچن کەوتنی گەلاکە مەرگی ئەوانیش نزیك دەخاتەوە ؟ من هەرگیز گوێم لە شتی وا نەبووە . نەخێر .. من ئامادە نیم بۆ تۆ دابنیشم‌و بمکەی بە مۆدێلی ئەو پیرە کەرەی گوایە کانچی‌یەکی خواپەرست‌و ڕەبەنە . پاشان .. بۆ تۆ لێ‌دەگەڕێی ئەم خەیاڵە پڕوپووچە بچێتە مێشکی ئەم کچەوە ؟ . ئای جۆنسی بەستەزمان‌و خنجیلانە ؟ »

سوو ـ وەلامی پیرەمێردەکەی دایەوەو تی :

« ئێستا زۆر لاوازو نەخۆشە .. گرانەتایەکی ئەوتۆی گرتووە کە مێشکی پڕ ببێ لە خەیاڵی سەیرو وڕێنەی نابەجێ . زۆر چاکە .. ئاغای بێرمان .. ئەگەر ناتەوێ ببیت بە مۆدێلی من‌و یارمەتیم نادەی .. پێویست ناکا .. مەیە . بەلام بەم شێوەیە .. من وای بۆ دەچم کە تۆ پیرێکی چەپەڵی ـ پیرێکی ئێسك‌گران‌و دەم‌شڕو بەدخووی . »

« ئەوەیە .. تۆش هەر ئافرەتی ! » بێرمان دەنگی

لێهەڵبڕی « کێ وتی من نابم بە مۆدێل ؟ بڕو .. لەگەڵتا دێم . نیوسەعات دەبێ من دەمەوێ بڵێم دێمو لە بەرامبەرت دادەنیشمو تۆش ڕەسمم بکە .. من ئامادەم . باشە .. حاڵی بووی .. ئێرە قەت شوێنێکی ئەوەندە شیاو نی‌یە بۆ کچێکی ژیکەلەو چاکی وەك جۆنسی بە نەخۆشی تیایدا بمێنێتەوە . ڕۆژێ دێ من ئەو شاکارەی خۆم تەواو بکەم .. ئەوسا هەموومان بەیەکەوە دەڕۆینو ئێرە بەجێ‌دێڵین .. ڕزگارمان دەبێ .. بەڵێ .. هەر وا دەبێ ! »

کە ئەوان بەیەکەوە چوونە سەرێ ، جۆنسی لە گەرمەی خەودابوو . سوو - دەرابەی پشت پەنجەرەکەی دادایەوە ، لەگەڵ پیرە بێرمان بۆ ژوورێکی دیکە خشین . لەوێ .. بەوپەڕی ترسەوە لە پەنجەرەیەکی کراوەوە سەیری بنەمێوەکەیان دەکرد . پاشان بێ‌ئەوەی چرپەیان لێوەبێ لە یەکدی ڕامان . بارانێکی بێ‌وچانیش سەرمای دەهێناو دەباری .. بەفرو بارانێکی تێکەڵ . بێرمان بەخۆو بە کۆنە کراسێکی شینەوە لەسەر کتلی‌یەکی سەرەونخونکراو دانیشت هەر وەك بڵێی کابرای کانچی‌یەو لەسەر بەردێك دانیشتبێ .

دوای نوستنی سەعاتەوەختێ بەیانی‌داو - سوو - لە خەو هەڵسا .. سەیرێکی جۆنسی کرد کە لەو دەمەدا چاوە زەقەکانی ئەبلەق ببوونو سەیری پەردە سەوزەکەی دەکرد کە تا ئەوجەلە دادرابووە . بانگی لێ کردو بەچرپە وتی :

« پەردەکە لادە ... دەمەوێ دونیا ببینم . »

سوو - بەوپەڕی سستی‌یەوە فەرمانەکەی بەجێ‌هێنا . بەلام .. زۆر سەیرە ! بەدرێژایی ئەو شەوە لێزمەی بارانو ڕەشەبای شێت‌وهار نەسرەوتوون .. لەگەڵ ئەو هەموو باوو بۆرانو زریانەش .. ئەوەتانێ .. هێشتا گەڵایەك بەرووی ئەو دیوارەوە خۆی گرتووە .. ماوەتەوە .. دوا گەڵای ئەو بنەمێوە ! ئێستاش لەلای قنچکی‌یەوە هەر سەوزە .. بەلام ڕوخ و لێوە مشاری‌یەکانی زەردو کاڵ هەڵگەڕابوون .. زەردی مردنو لەناوچوون .. کەچی لە بەرزایی بیست پێوە ئازایانە خۆی بە لقێکدا شۆڕ کردبووە .

جۆنسی وتی : « ئەوەیان دوا گەڵایە .. وتم بەدرێژایی ئەمشەو ئەم دوا گەڵایەش هەر هەڵدەوەرێ . گوێم لە هاژەی ڕەشەبا بوو . بەلام ئێمڕۆ ئەویش دەکەوێتە خوار ... ئەوسا لەگەڵ کەوتنی گەڵاکە منیش دەمرم . »

« ڕۆحەکەم گیانەکەم » سوو ئەمەی وتو ڕووە ماندووەکەی بەسەر بالیفەکەدا خوار کردەوە .. « ئاخر .. دە بیر لە من بکەرەوە ، ئەگەر بیر لە خۆت ناکەیتەوە .. هیچ نەبێ بەزەییت بە مندا بێتەوە . ئاخر من بێ تۆ چی بکەم ؟ »

بەلام جۆنسی وەڵامی نەدایەوە .. غەریبو دەگمەنترین شت ئەوەیە ڕۆحێك خۆی بۆ سەفەرێکی دوورو درێژ ئامادە بکا . خەیاڵی مەرگی خۆی هەموو مێشکی تەنی بووە .. هەرچەندە دۆستایەتی لەگەڵ ئەو خەڵك‌وخاکە کەمتر دەبووە .. ئەوەندە زووتر خۆی بۆ سەفەرە ئەبەدی‌یەکە ئامادە دەکرد .. بەڵێ بەرەبەرە پەیوەندی‌یەکان دەپچڕان .

ئەو ڕۆژە زۆر بەگرانی تێپەڕی ، هەتا ئەو ساتەش دەیانتوانی لەژێر تەمی زەردەپەڕی ئەو ئێوارەیە دوا گەڵا بەدی بکەن کە خۆی بە قنچکەکەیەوە شۆڕ کردبووەو بەرووی دیوارەکەوە خۆی هەڵواسیبوو ، کە شەویش داهات .. دیسانەوە بای باکوور شێتانە هەڵیکردو بەری بەرەڵلا بوو ، بارانەکەش بەخوڕ دەباری‌و دەیدا لەو تاقی پەنجەرە هۆڵەندی‌یانەو لە هەموو لایەکەوەش باراناوەکەی پیا دەهاتەخوار .

کە گزنگی‌داو دونیا ڕووناك بووە .. جۆنسی زۆر بێ‌بەزەییانە داوای کرد پەردەی پەنجەرەکەی بۆ هەڵبدرێتەوە .

دوا گەڵا نەکەوتبوو .. هێشتا وەکو خۆی مابووە . بۆ ماوەیەکی درێژ جۆنسی چاوی لەو گەڵایە نەترووکاند . پاشان بانگی سوو - ی کرد کە لەو ساتەدا خەریکی تێکوەردانی فرۆجاوەکەی سەر ئاگرەکە بوو . پاشان پێی وت :

« سوودی .. من کچێکی خراپو بەدخوو بووم .. شتێك .. هێزێك ئەم دوا گەڵایەی هێشتەوە تا بە من بڵێ کە من چەندە بەدو بلح بووم . گوناهێکی گەورەیە مرۆڤ مردن بخوازێ . ئێستا دەتوانی هەندێ شۆربام بۆ بهێنی .. لەگەڵ کەمێ شیر .. تۆزێ شەرابی پورتوگالی بتکێنە ناو .. هەروەها نا .. یەکەمجار ئاوێنەیەکم بۆ بێنە .. هەندێ سەرین بخە بەرپشتم .. حەز دەکەم بەدانیشتنەوە سەیری تۆ بکەم کە خەریکی چێشت‌لێنانیت . »

دوای ساتەوەختێ وتی :

« سوودی .. هیوام وایە ڕۆژێ لە ڕۆژان

ڕەسمی - نۆکەندی ناپلس - بکەم »

بۆ نیوەڕۆکەی کە دکتۆر هاتو سەیری کرد ، - سوو - بە بیانویەکەوە کەوتە دوای دکتۆرەکەو لە هۆڵەکەدا گرتی . ئەمیش دەستە چکۆلانەو لەرزۆکەکانی (سوو) ی خستە ناو لەپی خۆیو پیٚ ی وت :

« تەواو .. سەداسەد .. چابوونەوەی مسۆگەرە . بەو خزمەتە پوختە تۆ دەیبەیتەوە . لە خوارەوە نەخۆشێکی دیکەم هەیەو دەبێ ببینیم . بێرمان ناویکە - گوایە دەڵێن : هونەرمەندە .. ئەویش - سیل - یەتی . پیرو کەنەفتیشەو دەردەکەشی کوشندەیە . لێی بێئومێدم .. بەلام ئیمڕۆ دەیبەن بۆ نەخۆشخانەکەو بەڵکو لەوێ باشتر بێ . »

بۆ ڕۆژی دووەم دکتۆر هاتەوەو بە سوو - ی وت : « تەواو .. لە مەترسی چووە دەر . سەرکەوتیت . لەمەودوا وریای خزمەتو خواردنەکەی بەو بەس . »

ئەو نیوەڕۆیە - سوو - لە پێخەفەکەی جۆنسی نزیك بۆوە ، ئەویش بەوپەڕی ڕەزامەندییەوە شاڵێکی شینو بێکەڵکی خوریی گرتبووە دەستو دەیچنی . سوو - ش بەسەرینەکەوە جۆنسی گرتە باوەش باسکی تیوەریناو پیٚ ی وت :

« مشکە سپییەکەم .. دەمەوێ نهێنییەکت لا بدرکێنم .. ئیمڕۆ پیرە بێرمان لە نەخۆشخانەکە بەنەخۆشی سیل مردووە .. هەمووی دوو ڕۆژە ئەم نەخۆشییە سەری لێداوەو ئیتر مۆڵەتی نەدا . لەسەرلەبەیانی ڕۆژی یەکەمەوە دەرگاوانەکە سەرێکی بە ژوورەکەی ئەو داگرتووەو دیویەتی سستو بێگیان لەژێر باری ئازاردا کڕ کەوتووە .. سەرتاپای پێڵاوو جلەکانیشی تەڕ ببوونو لەو سەرمایەدا بەستبوویان . کەس نەیدەزانی لە شەوێکی وا ترسناکو تووشدا لە چ شوێنێ بووە .. لە کوێ ماوەتەوە . هەر ئەو بەیانییە چرایەکیان دۆزیبۆوە کە هێشتا نەکوژابۆوە لەگەڵ پەیژەیەك کە لە شوێنی خۆی گوێزرابۆوە .. چەند فلچەیەکیش لێرەو لەوێ کەوتبوون .. لەگەڵ پالێتێك کە چەند پەڵەیەکی زەردو سەوزی بەسەرەوە تێکەڵ ببوون ، ئا - لە پەنجەرەکەوە سەیرێکی دەرەوە بکە .. ڕۆحەکەم .. سەیرێکی دوا گەڵاکە بکە . تۆ تا ئێستا لە خۆت نەپرسیوەو سەرت لەوە سوڕنەماوە کە بۆچی ئەم گەڵایە هەرگیز ناجوڵێتەوەو لەرزەی بۆ ناکا هەر کاتێ ئەو بایە هەڵیدەکا ؟ ئاە ... گیانەکەم .. ئەوەیە شاکارە مەزنەکەی (بێرمان) ... ئەو شەوەی کە دوا گەلای بنەمێوەکە هەڵوەری .. بێرمان ڕەسمی ئەم گەلایەی کرد ! »

---

## کورتەیەکی ژیانی ئۆ . هێنری

لە ساڵی (1910) دا کە ئۆ . هێنری بەنەخۆشی سیل مرد بە گەورەترین چیرۆکنووسی ئەمریکی دەژمێردرا .. خەڵکێکی زۆر کورتە چیرۆکەکانی ئەویان دەخوێندەوە . ژمارەی ئەو چیرۆکانەی لە هەشت ساڵی کۆتایی تەمەنیدا نوسیبوونی گەیشتبوونە - سێ سەد - کورتە چیرۆك .. کەچی سەرنووسەری لاپەڕە ئەدەبییەکانو خەڵکیش زیاتریان لێدەویست . تا ئیمڕۆش کە نیو سەدە تێپەڕیوە ناوی خۆی نەدۆڕاندووە . هەر کۆمەڵە چیرۆکێکی ئەمریکی چاپ بکرێ دەبێ بەدوو - سێ چیرۆکی ئۆهێنری بڕازێتەوە .. (دوا گەلا) و (دیاری میێچای) نموونەی چاکی ئەم جۆرە چیرۆکانەن .

ناوی خۆی (ولیەم سیدنی پۆرتەر) ەو ئۆ . هێنری - یش نازناویەتی ، لە (گرینسبۆرو) ی باکووری - کارۆلینا - و لە ساڵی (1862) دا لەدایك بووە .

لە پانزە ساڵییەوە وازی لە قوتابخانە هێناوەو لە دەرمانخانەکەی مامیدا بووە بە شاگرد .. بەلام هەرگیز وازی لە خوێندنەوەی خۆی نەهێناوە . کە تەمەنی دەگاتە بیست سالانو لەبەر تەندروستییە ناپوختەکەی دەینێرنە - تێکساس - و لەوێ دەبێ بە شوانکارەو جەڵەبچی . دوو ساڵیش لەوێ دەژیو دەبێ بە هاوڕێی گاوانو شوانو جەڵەبچیو قەسابو دزی مەڕو بزنان .. پاشان لە (1907) دا ئەم کەسانە دەبن بە پاڵەوانی چیرۆکەکانی کە لە دوتوێی کتێبێکداو لە ژێر ناوی (دڵی ڕۆژئاوا) دا چاپیان دەکا .

لە ساڵی (1884) دا ئۆ هێنری خۆی گەیاندە بۆستن - و - تێکساس هەر لەوێ نیشتەجێ بوو پاشان ژنی هێناو لە بانقێکدا کرا بە (کاتب) .. دوای چەند ساڵێك کەڵکی لەو سەردەمە وەرگرتو کەرەستەی چەند چیرۆکێکی لە لا خولقاند .. هەر ئەوسا توانی چەند چیرۆکێکی کۆمیدی بۆ ڕۆژنامەو گۆڤارەکان بنووسێ . بەلام لە (1896) دا کتوپڕ کارەساتێك ژیانی لێشێواندو لە بانقەکە دەریان کرد چونکە حسێبی پارەو

پووله‌که‌ی به‌رده‌ستی کورتی هێنابوو .
هه‌رچه‌نده خۆی سوور بوو له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی که بێ‌گوناه بووه‌و هیچ فڕوفێڵێکی له ژێر سه‌ردا نه‌بووه .. به‌ڵام له ترسانا بۆ ئه‌مریکای ناوه‌ڕاست ڕای کرد . دوای شه‌ش مانگ گه‌ڕایه‌وه تێکساس .. ئا له‌م کاته‌دا ژنه‌که‌ی ده‌مردو ناچار به‌جێی نه‌هێشت . هه‌ر له‌وێ گیراو ناردیانه به‌ندیخانه‌ی فیدرالی له (کۆله‌مبس) - (ئۆهیۆ) .. پتر له سێ ساڵ له‌و به‌ندیخانه‌یه مایه‌وه . له‌وێش وازی له چیرۆك نه‌هێناو نازناوی (ئۆهێنری) ی بۆ خۆی هه‌ڵبژارد که ناوی یه‌كێ له پاسه‌وانه‌كان بووه - ئۆرین‌هێنری - ئه‌گه‌رچی ئێستا ساغ بۆته‌وه که ئۆ . هێنری بێ‌گوناه بووه‌و پولێکی له‌و بانقه نه‌دزیوه .. به‌ڵام ئازایانه‌و بێ‌گله‌یی‌کردن له به‌ختی خۆی ماوه‌ی به‌ندیتی‌یه‌که‌ی برده سه‌ر . هه‌ر له‌م ئه‌زموونه تاڵه‌ی‌خۆیه‌وه‌و له هه‌موو ئه‌و کاره‌سات‌و ده‌ردسه‌ری‌یه‌ی له ژیانیدا دیبوونی هه‌ست‌و سۆزێکی مرۆڤانه‌ی لا ده‌خولقێ بۆ ئه‌و که‌سانه‌ی وه‌ك خۆی بێ‌به‌خت‌و چاره‌ڕه‌ش‌و نه‌گبه‌ت بوون .. ئه‌وانه‌ش له چیرۆکه‌کانیا ڕه‌نگ ده‌ده‌نه‌وه .

له ساڵی (1902) دا گه‌ڕایه‌وه - نیویۆرك - ئیتر له‌وێ هه‌موو کاتی خۆی بۆ نووسین ته‌رخان کرد .. وای لێ‌هاتبوو له مانگێکدا (حه‌وت) چیرۆکی ده‌نووسی . زۆر به‌سۆزو تێگه‌یشتنه‌وه که‌سانی ساده‌ی کۆمه‌ڵی ده‌کرد به پاڵه‌وانی چیرۆکه‌کانی‌و چه‌ند پله‌یه‌ك چیرۆکی ئه‌مریکی سه‌رخست . ئه‌نجام‌و کۆتایی چیرۆکه‌کانی مرۆڤ ده‌خاته سه‌ر دڵه‌کوتێ‌و هه‌میشه به‌سه‌رسوڕمان‌و زاردابچڕینه‌وه جێمان‌دیلێ .. چیرۆکی (دوا گه‌ڵا) نموونه‌ی ئه‌م ڕاستی‌یه‌یه .

چل‌وهه‌شت ساڵی پڕ له ده‌رده‌سه‌ری به‌سه‌ر برد .. توانی شاری نیویۆرك‌و خه‌ڵکه‌که‌ی به دونیا بناسێنێ .. به‌ر له‌وه‌ی بمرێ دوا قسه‌ی ئه‌وه بووه :

« په‌رده‌که لاده‌ن تا - نیویۆرك - ببینم ! »

● له کتێبی

O. HENRY
SELECTED STORIES
Progress Publishers
Moscow 1977 86 — 90 لاپه‌ڕه

نووسینی : سۆمه‌رست مۆم
ئه‌وزاد عبدالله ئاغا باوه
له ئینگلیزی‌یه‌وه وه‌ریگێڕاوه

خوا ئه‌یزانێ ، چه‌نده‌ها جار داخی دڵی خۆمم هه‌ڵڕشتوه‌وگله‌ییم له‌وه کردووه که نیوه‌ی ئه‌و کاته‌م نه‌بووه تانیوه‌ی ئه‌وشتانه‌ی ویستومن تێیدابیکه‌م . بیرم ناکه‌وێته‌وه له‌ڕابووردوودا چ‌کاتێك ، ساتێکم بووبێت بۆخۆمم ته‌رخان‌کردبێت .

چه‌نده‌هاجار یه‌ك هه‌فته‌ی ڕێك بێ‌ئیش بووم‌و به‌لامه‌وه شتێکی‌سه‌یرو خۆش بووه . ئێمه زۆربه‌مان ئه‌گه‌ربه ئیشه‌وه خه‌ریك نه‌بین ، ئه‌وا به یاری‌یه‌وه خه‌ریکین ئه‌سپ‌سواری ، تێنس ، گۆڵف ، مه‌له وه‌یان قومار ئه‌که‌ین به‌ڵام من هه‌رگیز هیچ شتێکم نه‌ده‌کرد ، له به‌یانی‌یه‌وه داده‌نیشتم تاپاش نیوه‌ڕۆ کاتم به‌فیڕۆ ده‌دا ، وه‌تا ئێواره‌ش له‌به‌ر ته‌مه‌ڵی له‌جێی خۆم نه‌ئه‌جولام خه‌یاڵم بۆ هه‌زار شوێن ئه‌چوو . هه‌ر سه‌عاتێکیش تێ‌ئه‌په‌ڕی .

نیسفەنجێکی جیهانی ئەقڵ هەموو ئەو خەیاڵانەی کە لە مێشکمدا تۆمار ئەبوون هەموویانی دەسڕییەوە . کات لەبەر ئەوەی ئەوەندە خێرایە ، لە بەر ئەوەی لەو دیو وەبیرهاتنەوەوەیە خۆشەویسترین بەرژەوەندی مرۆڤەو دابەشکردنی خۆشترین و نەرمترین شێوەی پێوە خەریك بوونە کە بەڕاستی مرۆڤ ئەتوانێ تیایدا بکوڵێ .

کیلۆپاترا گەوهەرێکی گران بەهای لە پێکێك شەرابدا تواندەوەو دایە دەست ئەنتۆن کە بیخواتەوە . کاتێ تۆ چەندساتێکی کورتی زێڕین بەفیڕۆ ئەدەیت پێکەکە دەهێنێ و گەوهەرە تواوەکەی ناوی دەڕێژێتە سەر زەوی . سەرلەقاندن ، شتێکی نایابەو خۆشەو وەکو هەموو سەر لەقاندنێکی نایاب و خۆش شتێکی هیچ و پووچەو لەگەڵ ئەقڵدا ناگونجێ . بێگومان ئەمە بیانووەکەیەتی . هەفتەیەکیان بڕیارم دا کە بخوێنمەوە ، بەلام لەبەر ئەوەی خوێندنەوە دەرمانی دەردی ئەوانەیە کەپێی ڕاهاتوون هەرکاتێ لە پارچە کاغەزێکی چاپکراویان . دوورخەیتەوە زۆر پەست ئەبن و مەزاجیان ئەشێوێ ..ئارامیان نامێنێ ، هەروەك چۆن یەکێك کە لەسەر خواردنەوە ڕاهاتبێ ، ئەگەر براندی نەبێت ، یان شیلاگ وەیان ئیسپرتۆیەکی میثالاوی دەخواتەوە ، هەمان شت دەکاتەوە لەگەڵ پرۆپاگەندە کردن بۆ پەرەیەکی ڕزیوی پێنج ساڵە .

هەمان شت دەکاتەوە لەگەڵ دەلیلی تەلەفۆندا .

بەلام ئەگەر یەکێك خۆی چیرۆك نووس یان نووسەر بێت ، بەدەگمەن کتێب خوێنەرەوەیەکی هیچ و بێ ئاگا دەرئەچێت . من خۆزگەم خواستووە کە خوێندنەوەکەم جۆرێکی تری هیچ و پووچی دەرچێت . وام بیر دەکردەوە کەئەگەر بهاتایەو تووشی ڕۆژێکی خۆش بوومایەوە لەوڕۆژەدا بمتوانیایە کاتێکی بێ ئیشی بێ گیروگرفت بەخۆشی بەسەربەم ، ئەو پرۆژەیەم هەر تەواو دەکرد کەزۆر لەمێژەوە جوولاندبوومی و خۆم پێوە خەریك کردبوو ، هەموو کتێبەکانی نیك کارتەرم دەخوێندەوە .

بەلام من تائێستاش وەکوکابرایەکی دۆزەرەوەی شتی بێ نەزانراوم و گەشتە دۆزینەوەییەکانم بەرەوشارێکی نەدۆزراوە ڕێك ئەخەم . هەموو کات وام بەخەیاڵدا هاتووە کە ساتەکانم بەپێی مەیلی خۆم لەگەڵ دەوروبەردا هەڵبژێرم . نەك بەجۆرێك کەباربێت بەسەرمەوەو زۆرم لێ بکا . هەر کاتێکیش کە ڕووبەڕووی شتێکی چاوەڕوان نەکراو بووبێتم ، هەر چەندە ئەگەر گیروگرفتیش ببوایە ، ئەوپەڕی توانام خستۆتە کار . ( وەکو چۆن ناسیاوێکی سەر کەشتییەکی بازرگانی لە ئۆقیانووسی هێمندا دەعوەت بکەیت و پێی بڵێی کەلەلەندەندا لەگەڵت بمێنێتەوە ، بەلام ئەویش بێ ئەوەی ئاگادارت ، بکات بە مالدا ) ئەوە بەلامەوە شتێکی لەپڕو سەیر نەبوو ، لەمەکسیکەوە چووم بۆڤێراکۆز بۆئەوەی یەکێك لەکەشتییەکانی گواستنەوەی کۆمپانیای وارد بەکرێ بگرم بۆ یۆکاتان . کەچی ڕێك ئەوەی لێی ئەترسام هاتەدی ، لەشەوەوە ڕایان گەیاندبوو کەبەندەرەکە باری لێدائەگرن ، کەشتییەکەی منیش ئەو ڕۆژە بەندەری نەگرت تا باربکرێت لەڤێراکۆز مامەوە ، ژوورێکم لەئوتێلی دیلیجنسیاس گرت کە بە سەرگۆڕەپانە گشتییەکەدا دەی ڕوانی ، بەیانیی ئەوڕۆژەم بەسەر برد بەسەیرکردنی ئەولاو ئەولای شارەکە .

دابەزیم و بەناو شارەکەدا ئەسووڕامەوە ، ئەم ڕوانی یە کۆشکە خۆش و جوانەکانی .

هێواش هێواش بەبەردەمی کەنیسەی ئەبریستییەکاندا پیاسەم ئەکرد . کەنیسەیەکی جوان پەیکەری ، بەشێوە وەك مرۆڤ ، بەلام ترسناکی لێ بوو . پایەکانی کەنیسەکە بەئاسماندا چوو بوون ، ڕەشەبایەکی بەهێزو تیشکی سوتێنەری خۆر دیوارەکەتە گەورەکانی کەنیسەیان زۆربەجوانی ڕازاندبوەوە . گومەزی کەنیسەکە بەپارچە لەوحی شین و سپی داپۆشرابوو . ئالەو کاتەدا وام هەست کرد کە ئەوەی پێویستە ببینرێ ، هەموویم بینیوە ، بۆیە چوومە شوێنە فێنکەکەی ڕاڕەوەکەو خواردنەوەیەکم بانگ کرد .

تیشکی ڕۆژ بێ بەزەییانە بەسەر تەواوی گۆڕەپانەکەدا پەرش بووەوە . کوێزە هیندییەکان شۆڕ ببونەوەو تەپ و تۆزیان لەسەر نیشتبوو ، بازە ڕەشە گەورەکانیش جارجارە لەسەریان دەنیشتنەوەو هەڵدەفڕینەوە ، ئەگەر شتێکیان لەسەر زەوی بدیایە ئەنیشتنەوە تا هەڵیگرن و پاشان بەباڵە کراوەکانیان هەڵئەفڕینەوە سەر بورجی کەنیسەکە . منیش دیقەتم دابووە ئەو خەڵکەی کەبەگۆڕەپانەکەدا تێ دەپەڕین .

ڕەش پێست ، هیندی ، کریۆلی ، ئیسپانی و جۆرەها

ڕەنگ ، پێست ڕەش و پێست سپی ، هەر کە بەیانی ڕابووردو ، مێزەکانی دەوروبەرم هەمووی پڕ بوون لە خەڵك ، بەزۆری پیاوبوون هاتبون پێش‌نانی نیوەڕۆ شتێ بخۆنەوە ، زۆربەیان دۆکی سپیان لەبەربوو ، هەندێکیان جلە ڕەشەکانی ئیشیان لەبەردابوو هەرچەندە کەگەرەمیش بوون ، بەڵام شایانی ڕێز لێ نانیان‌بوو . چەند کەسێك لەولاوە ، گیتارژەنێك ، کەمان ژەنێکی کوێر ، موسیقاژەنێك ، مۆسیقای ئەمریکی‌یان لێئەدا ، پاش هەموو نەغمێك گیتار ژەنەکە بەخۆی‌و پارچەیەك کاغەزەوە هەڵدەستایە سەرپێ . لەوەوپێش ڕۆژنامەم کڕی‌بوو ، کەچی ڕۆژنامە فرۆشەکان زۆریان لێئەکردم کەهەمان ڕۆژنامەیان لێبکڕم ، منیش چەندیان کردو خەریك‌بوون هەرلێم نەکڕین ئاە بەلایەنی کەمەوە بیست‌جار زیاتر دەنگم‌دان کەبڕۆن‌و وازم لێبێنن . خۆ بۆیاخ‌چی‌یە هەژارە دڕەکان وەك بنێشت پێمەوە نووسابوون ، دەیان ویست پێڵاوەکانم کە یەك پەڵەشیان پێوە نەبوو بۆیاغی‌بکەن .

کاتێ زانیم کەپارەکەم هاتۆتە کزی سەرێکم بۆ ئەو سواڵکەرە پەستکەرانە ڕادەوەشاند کە تووشیان دەبووم ئەو سواڵکەرانە لەگەڵ هیچ کەسێکدا ڕێك نەدەکەوتن . هەندێ ژنی هیندی جل شڕو پڕم بینی ، هەریەکەیان منداڵێکیان بەشالێکەوە بە پشتیانەوە توند کردبوو ، دەستە چرچ‌و لۆچە کانیان پان دەکردەوەو دەنگە کیویی یەکانیان لێ هەڵبڕی بوو نەیان دەبڕی‌یەوە ، هەندێ منداڵ دەستی پیاوە کوێرەکانیان گرتبوو بۆسواڵکردن دەیان هێنانە دەوروبەری مێزەکەی کە لێی دانیشت بووم .

شەل‌و کوێر ، نوقسانەکان‌و دزێوەکان شوێنە بریندارەکان‌و پێستە هەڵاڵراوەکانی لەشیان وەدەرخست‌بوو کەیان هەر لەزگماکەوە وابوون یان بە هۆی ڕووداوێکەوە ئاوا دزێو بوون . منداڵەڕەش‌و ڕووتەکانیش بەردەوام بۆ فلسە سورێ هەر بوڵەیان بوو ، نەیان دەبڕی‌یەوە ، هەمووکاتێکیش هەر چاوێکیان لەلای پۆلیسە قەڵەوەکەوە بوو کە قامچی‌یەکی تێ دەسرەواندن یان‌پشتیان یان سەریانی بریندار دەکرد ، منداڵەکانیش بۆی دەرئەچوون .
تەنها بۆ ئەوەی جارێکی‌تر بێنەوە ، پۆلیسەکەیان بەم بگرەو بەردەیە خەریك دەکرد تا بەتەواوی هیلاکیان دەکرد .
لەپڕێکدا سواڵکەرێك سەرنجی ڕاکێشام ، کە لە زۆربەی سواڵکەرەکانی تر نەدەچوو . لەڕاستیدا لەوخەڵکەی لەدەوروبەریشم دانیشت‌بوون لەوانیشی نەدەکرد . ئەسمەرێکی مووڕەش ، ڕیشێکی سووری هێشت‌بووەوە . کابرایەکی گورج‌و گۆڵ‌و ترسناك دیاربوو . هەندێ شوێنی ڕیشی تاشرابوو ، قژێکی درێژی هەبوو کە لەوە ئەچوو چەند مانگێك بێت نەتاشرابێت سواڵکەرەکە پانتۆڵێك‌و کراسێکی لەبەردابوو ، بەڵام کراسەکەش‌و پانتۆڵەکەش شڕو پڕ ببوون پیس‌وبۆن ناخۆش بەهەزارویەك تەقەڵ پێکەوە نووسابون . هەرگیز لەژیانمدا مرۆڤی ئاوا لاوازم نەدی بوو ، قاچ‌و قولە ڕووتەکانی تەنها هەر پێست‌و ئێسکەکە بوون . لە شوێنە دڕاوەکانی کراسەکەیەوە ، پەراسووە کانی یەکە یەکە دەژمێرران . بەئاسانی دەت‌توانی یەکە یەکە ئێسکەکانی پێیە بەتۆز داپۆشراوەکەی بژمێریت . لەناو ئەو کۆمەڵە هەژارو سواڵکەرانەدا ئەمەیان لە هەموویان داماوتربوو ، سواڵکەرێکی پیر نەبوو ، لە چل ساڵ زیاتر نەدەبوو ، منیش لەخۆم دەپرسی‌و دەم‌وت ئایا چی‌ئەم داماوەی هێناوەتەئێرە ؟ هەرگیز ڕێی‌تێ نەئەچوو بەو جۆرە بیربکەیتەوەو کەئەگەر ئیش لەو شوێنەدا وەدەست کەوتایە ، ئەوئیشی نەدەکرد . تەنها سواڵکەر بوو لەم ناوەدا کە هیچ قسەی نەدەکرد . سواڵکەرەکانی‌تر بەسەرت‌دا ئەبارین‌و زۆر لێت ئەپاڕانەوەو دوعایان بۆ ئەکردی ئەگەر ئەمەش نەبوایەتە هەست جولانت بەرامبەریان ، بەردەوام داوای خێرێکیان لێ دەکردی ، تاوایان لێدەکردی کەقسەیەکت لەدەم دەردەچوو و دەرت دەکردن .

بەڵام کابرای سواڵکەر هیچی نەدەوت ، وابزانم وای هەست دەکرد کە ئەو شێوە هەژاری‌و داماوی‌یەی بەسە بۆ جولاندنی هەستی خەڵکی بەرامبەری ، تا یارمەتی بدەن . کابرا تەنانەت دەستیشی پان نەدەکردەوە . زۆربە دڵ خۆشی‌یەوە تێی دەڕوانیت ، بەڵام داماویەك‌و کەساسیەك لەچاوەکانیداو بێ‌هیوایی‌یەك لەدەستەکانی‌دا دەبینرا کەبەڕاستی زۆر ترسێنەربوو . بێ دەنگ ڕائەوەستاو نەدەجولاو چاوی تێ دەبڕیت‌و ئەگەر تۆش ئاگات لەو نەبوایەو خەیاڵت لە شوێنێکی تر بوایە ، لەسەرخۆ بەهیواشی بەرەو مێزێکی تر ئەکەوتەڕێ . ئەگەر داوای شتێکی بکردایەو تۆش نەت دابایە ، هەرگیز تووڕەیی‌و بێ هیوایی پێشان نەئەدا . ئەگەر یەکێ عانەیەکی بۆ ڕاگرتایە ، تۆزێ ئەهاتە پێشەوەو دەستە شێوە چرنووکی‌یەکانی

بۆدرێژ ئەکرد ، بێ‌سوپاس لێ‌ی وەرئەگرتی‌و بێ‌ئەوەی هیچ سۆزێك پێشان بدات ملی ڕێگەی ئەگرت . کاتێ کە گەیشتە لای من لەبەر ئەوەی هیچی وام پێ نەبوو بیدەمێ بۆ ئەوەی بێ هودە ڕانەوەستێ ، سەرێکم بۆڕاوەشاندو " دسپێنز ئۆستید پۆر دیۆس " ئەم ڕستەیەم پێ ووت کەئیسپانی‌یەکان سواڵکردن بەحەرام دادەنێن ، بێ‌گومان بەلەهجەی کاستیلیانی ئیسپانی .

بەلام سواڵکەرەکە ئەوەندە گوێ‌ی بە قسەکەی من نەداو لەبەر دەممدا وەستابوو بەچاوێکی تراجیدیی‌یانەوە تێ‌ی دەڕوانیم . بەڕاستی هەرگیز شکەست هێنانی مرۆڤایەتیم بەو شێوەیەلە ژیانمدا نەبینی بوو . شێوەی کابرا هەندێ شتی ترسێنەری تیا دەبینراو لەکابرایەکی ئەقڵ تەواوی نەدەکرد . دواجار کابرا تێ‌پەڕی‌و ڕۆیشت . کات ژمێریەك بوو ، منیش نانی نیوەڕۆم خواردبوو . سەرخەوێکم شکاند . کاتێ خەبەرم بوەوەو دنیا هێشتا هەر گەرم بوو تاوای لێ کردم ناچار ووتم ئەچمەدەرەوە بۆ گۆڕەپانەکە .

چوومەوە بۆ گۆڕە پانەکە لەڕارەوەکەدا دانیشتم‌و خواردنەوەیەکی خۆشم بانگکرد ئەو کاتە بوو کە خەڵکەکە بە ورۆژم لەشەقامەکانەوە بەناو کون‌و کەلەبەری شارەکەدا بلاو دەبوونەوە هەموو مێزەکانی چێشتخانەکە پڕببون لەخەڵك .

لەناوەڕاستی باخچەکاندا هەندێ کەس یاری‌یان دەکرد . شوێنەکە تادەهات قەرەباڵغ تر دەبوو . لەسەر کورسی‌یە درێژەکان خەڵك بەکۆمەڵ دانیشتبوون دەت‌ووت هێشووە تری‌ی ڕەشن بەسەریەکدا کەلەکە بوون . ووت‌و وێژی خەڵکەکەش غەڵبەغەڵبێکی گەورەیان دروست کردبوو . بازە ڕەشە گەورە کانیش هەڵدەفڕین‌و لەئاسماندا دەیانچریکاند کاتێ کەشتێکیان لەسەر زەوی ئەبینی بۆی نزم دەبوونەوە تاهەڵیگرنەوە ، یان‌زۆر بەخێرایی لەبەینی ئەوخەڵکەی کە بەوێدا دەڕۆیشتن فڕەفڕیان بوو ، وەهەرکە زەردە ئەکەوتە دەمکەل بەکۆمەڵ لە هەموو شوێنەکانی شارەکەوە ، هەڵئەفرین بەرەو بورجەکانی کەنیسەکە ، زۆر بەبڕی بازنەیەکیان بەدەوری بورجەکە دروست دەکرد .

ئەیان چریکاندو شەڕیان ئەکردو بەڕووی یەکتریدا دەیان‌زیقاند تالەدوایی زۆربەگرانی لەشوێنەکانیان ئەنیشتنەوە . دیسانەوە جارێکی‌تر بۆیاخ‌چی‌یەکان لێم‌پارانەوە بۆئەوەی پێلاوەکانم بۆیاغ‌بکەن ، ڕۆژنامە فرۆشەکان ڕۆژنامە شێدارەکانیان خستە بەردەمم سواڵکەرەکان کەساسانە داوای یارمەتی‌یان لێ دەکردم . جارێکی‌تر کابرا ڕیش سوورەکەم بینی‌یەوە . دیقەتمدا بەبێ جوڵە یەکە لەبەردەم مێزەکاندا ڕائەوەستاو سەروسیمای شێوا بوو لە قەرەباڵغی‌یەکەدا . هات‌و لەبەردەم مێزەکەی منا ڕانەوەستا ، وابزانم بەیانی بیرکەون‌بوەوە وە وای زانی‌بوو وەستان لەبەردەم مێزەکەی مندا بێ‌کەڵکە ، بۆیە نەی ویستووە بۆ جارێکی‌تر دووبارەی بکاتەوە .

هیچ ڕیش سوورێکی‌تری مەکسیکت لەو ناوەدا نەدەبینی ، لەبەر ئەوەی تەنها لەڕووسیادا سەرو سیمای ئاوا هەژارم بینی‌بوو لەخۆم دەپرسی‌و دەم‌وت تۆبڵێ‌ی ئەو نەگبەتە بەڕێکەوت ڕوسی نەبێت بەڕاستی ئەم‌شێوەیەو سەروسیمای لە ڕووسی‌یەکی لاوازو بێ‌تاقەتی دەکرد کە تەواو ڕووخابێت‌و لەڕەش بینی‌دا نقووم بوو بێت بەلام لەگەڵ ئەمانەشدا کابرا لەڕووسی نەدەچوو . دەم‌و چاوی ڕوسی‌یانە هەڵنەکەوت بوو ، لەشە لاوازەکەی زۆر ئاشکرا بوو ، چاوە شینەکانی لەگەڵ شێوەی هەڵکەوتنی چاوی ڕووسی‌یەکان ڕێك نەدەکەوت . لەخۆم دەپرسی‌و دەم‌ووت تۆبڵێ‌ی دەریاوانێکی ئینگلیز ، سکۆندەناڤی ، یان ئەمریکی نەبووبێت‌و ئاش بەتالی لێ‌کردبێ‌و وردە وردە ئاواخۆی بەم حالەدا گەیاندووە .

کابرای سواڵکەر دیار نەما ، لەبەر ئەوەی لەوێ هیچ شتێکی تری لێ‌نەبوو تا خۆمی پێوە خەریك کەم ، وەستام تابرسیم بوو ، دوای ئەوەی نانم خوارد دیسانەوە هاتمەوە دانیشتم تا چۆڵ بوونی شوێنەکە دەری‌خست کەکاتی ڕۆیشتنەوەیەو منیش ڕۆیشتمەوە . بەڕاستی ئەبێ بڵێم کە ئەوڕۆژە ڕۆژێکی زۆر درێژ بوو بەلای‌منەوە . لەخۆم دەپرسی‌و دەم‌وت ئاخۆ دەبێ چەندڕۆژی تر ئاوا بەزۆر بەسەر بەرم . لەژوورەکەمدا تۆزێ خەوم لێ‌کەوت . بەلام زۆری نەخایاند خەبەرم بوەوەو خەوم لێ‌نەدەکەوتەوە . ژوورەکەم ژوورێکی زۆر خەفە بوو ، پەنجەرەکەم کردەوەو دەم‌ڕوانی‌یە کەنیسەکە ، مانگ لەئاسماندا دیار نەبوو ، بەلام ئەستێرەکان گەورەو درەوشاوە بوون . بازەکان بەسەر گومەزی کەنیسەکەو لێواری بورجەکە زۆر لێك نزیك هەڵ نیشتبوون‌و جارجارە تۆزێ ئەجولانەوە ، کاریگەری‌یەکی زۆر نامۆیان هەبوو . نازانم بۆچی لەو کاتەدا ئەو داوەڵە ڕیش سوورە ئەوەندە کەوت بووە خەیاڵمەوەو

لەکەللەی دابووم‌و زۆرم بیر لێ‌ی دەکردەوە . زۆر سەیر بوو لەپڕێکدا وام هەستکرد کە لەوەوپێش بینیومە ، شتەکە وا لەمێشکمدا وروژابوو بەجۆرێك نەی‌دەهێشت کەتۆزێك چاوم بچێتە خەو ، دڵنیابووم لەوەی کەپێش ئەوکاتە لە شوێنێك هەر پێ‌ی گەیشتووم ، بەڵام کەی‌و لەکوێ ، ئەمەیان نازانم . هەوڵمدا ئەو شوێنە بخەمەوە بەر چاوم‌کە ئەوم تێدا بینی‌یەوە بەڵام لەتارمایی‌یەك‌و شوێنێکی لێڵ‌زیاتر هیچم هەڵنەکراند . هەر خەوم لێ نەکەوت ، کاتێ کە بەرەبەیان نزیك بوەوە ، تۆزێ فێنکی کرد ، ئەوکاتە چاوم چووە خەو . ڕۆژی دووەمیش هەر وەك ڕۆژی یەکەم لەڤێراکۆز بەسەرم برد چاوەڕێم دەکرد سواڵکەرە ڕیش سوورەکە ببینمەوە . هەرکە بینیم لەنزیك مێزەکەی تەنیشتمەوە وەستابوو ، تەواو دڵنیابووم لەوەی کە لەوەوپێش لەشوێنێ بینیومە ، تەنانەت لەوەش دڵنیا بووم کە لەوەوپێش ناسیومەو قسەشم لەگەڵ کردووە . بەڵام تا ئەوکاتە هیچ‌یەکێ لەشوێن‌و کاتەکانم بیر نەدەکەوتەوە کە تیایدا بینیوومە . جارێکی‌تر بەلای مێزەکەمداتێ پەڕی‌یەوەو ڕانەوەستا . کاتێ‌کە ڕوو بەڕووی یەك بووینەوە ، چاوم بڕی بووە چاوی تاشتێکم لێوەی بیربکەوێتەوە . نەخێر هیچم بیر نەکەوتەوە لەخۆم دەپرسی‌و دەم ووت لەوانەیە هەڵەبم‌و ، وابیرم دەکردەوە کەئێستا دەڵێم لەوەو پێش بینیوومەو ناسیوومە . هەرڕێك بەو جۆرەیە کەهەندێ جارچەند گۆڕانێکی سەیر لەمێشکدا ڕوودەدات بەجۆرێك لەکاتی کردنی ئیشێك لەشوێنێکی دیاری کراودا ، وائەزانی لە ڕابردووشدا هەمان ئیشت لە هەمان شوێندا کردووە . بەڕاستی نەم ئەتوانی ئەو فکرە نادیارەی کە لە هەندێ ساتی تایبەتی‌دا ئەوەی خستبووە مێشکمەوە ، لەمێشکمی دەرکەم تەواومێشکی خۆم شلەژاندو وام‌لێ‌هات ئەوکاتە دڵنیابووم لەوەی کەسواڵکەرەکە یان ئینگلیزە یان ئەمەریکی‌یە ، بەلامەوە جوان نەبوو بچم قسەی لەگەڵ بکەم ، هەر بیرم دەکردەوە لەکوێ بینیوومەو چۆن بووە .
ئاخۆ کەی بینیوومەو لەچ بیرەوەری یەکدا بووە . تەواو لەوە پەست بوو بووم کەنەم دەتوانی بیناسمەوە ، وەك‌و چۆن کاتێك ئەتەوێ ناوی یەکێکت بیرکەوێتەوە لەسەر زمانتە بەڵام بۆت نایەت ، منیش وام لێ‌هات‌بوو ، بیرم نەدەکەوتەوە .
ئەوڕۆژە ، ڕۆژێکی‌تر ، بەیانی‌یەکی‌تر ، ئێوارەیەکی‌تر بەسەر چوون. ڕۆژێکیان یەك شەممەبوو ، گۆڕەپانەکە لەهەموو ڕۆژێ قەرەباڵغ‌تر بوو ، کۆمەڵێ مێزی زۆر لە ڕاڕەوەکەدا دانرابوون ، سواڵکەرە ڕیش سوورەکە دیسان پەیدا بوەوە ، لەبێ دەنگی‌یەکەی‌و جل‌وبەرگە شڕو پڕەکەی‌و حاڵە ناهەموارەکەی کە هەستی پیاویان دەجوولاند ، بەڕاستی شێوەیەکی زۆر ترسناك ئەبینرا . هات‌و دوو مێز لەولا مێزەکەی منەوە ڕاوەستا . زۆر بێ‌دەنگ بوو و هیچی نەدەوت . بەڵام دیار بوو دەپاڕایەوە ، زۆر بێ دەنگ پاڕایەوە بێ ئەوەی سەریشی ڕاوەشێنێ . ئالەو کاتەدا پۆلیسەکەم بینی کە سواڵکەرەکانی دەردەکردو بەناو خەڵکەکەدا بڵاوببوونەوە . ویزەیەکی لە قامچی‌یەکەی هێنا ، سواڵکەرە ڕیش سوورەکەش گەڕایە دواوەو هیچ جۆرە ناڕەزایی‌یەك یان تووڕە بوونێکی پێشان نەدا ، چونکە لەوە ئەچوو کەجوێن‌و هەست بریندار کردن‌و لێدان بەقامچی بەدەرکردنێکی ئاسایی دانابێ ، بەڵام بەڕاستی شێوە هەست جولێنەرەکەی ئێستاش هەر لەبەر چاوم دابوو . بەهێواشی ڕۆیشت‌و لەناو قوڵایی تاریکە شەوی گۆڕەپانەکەدا لەچاوون بوو . لەپڕێکدا بیرم کەوتەوە نەك ناوەکەی کەتائێستاش هەر نەم دۆزی‌یەوە ، بەڵام هەموو شتێکی‌تر ئەوسواڵکەرە دەبوو من بناسێتەوە ، چونکە من لەم بیست‌ساڵەی ئەم دوایی‌یەدا هیچ نەگۆڕابووم . هەر لەبەر ئەمەش بوو دوای یەکەم بەیانی کەمنی بینی ،ئیتر ڕووی نەکردەوە سەر مێزەکەی من ، بەڵێ نزیکەی بیست ساڵ ئەبێت ئەی‌ناسم . هاوینێکم لە ڕۆما بردە سەر ، ڕاهات بووم هەموو ئێوارەیەك لە چێشتخانەیەك نانم ئەخوارد لەڤایا سیستانا ، کەمەکەڕۆنی‌یەك‌و خواردنەوەیەکی باشی هەبوو ، زۆر جار هەندێ قوتابی بەشی هونەرو ئاداب ،کەخەڵکی ئینگلتەرەو ئەمریکابوون ئەهاتن بۆ چێشتخانەکە . لەگەڵ یەك دوو نووسەریش . ئێمەش فێر بوو بووین تانیوەشەو لەوێ ئەماینەوە بەهەندێ باسی‌بێ کۆتایی دەربارەی هونەرو ئەدەبەوە خۆمان خەریك کرد بوو .

ئەم ڕیش سوورەش هەموو کات لەگەڵ هاوڕێ‌یەکی گەنجی‌دا کەوێنەکێش بوو ئەهاتن بۆ ئەوێ . ئەو کاتە کوڕێکی گەنج بوو ، تەمەنی ئەو کاتە لە بیست‌و دوو تێپەڕی نەدەکرد ، دوو چاوی شین‌و لووتێکی ڕێك ، قژێکی سوور هەرجوان بوو تەماشای‌کەی ، بیرم دێتەوە زۆرلە بارەی ئەمریکای ناوەڕاستەوە قسەی دەکرد .

دیار بوو ئیشی هەبوو لەگەڵ کۆمپانیای میوەی ئەمریکی‌دا

بەلام ئیشەکەی ئەو کۆمپانیایەی وازلێ هێنابوو دەیویست ببێتبە نووسەر ، ئەو کاتە لەناو ماندا ناسراو نەبوو ، باش‌نەمان دەناسی خۆی لەئێمە بەگەورەتر ئەزانی‌و ئێمەش ئەوسا هیچمان ئەوەندە ژیرو ئاقل نەبووین کەچاو لە خۆبەزل زانینی گەنجێکی ئاوا بپۆشین .

ئەوئێمەی بەهەژار ئەزانی‌و بێ‌ترسیش پێی دەوتین . ئیشەکەی خۆی پێ نەدەوتین چونکە هەڵسەنگاندنەکانمانی پێ هیچ‌بوو ، گاڵتەی بەرەخنەکانمان دەهات . زۆر کورێکی لە خۆبایی بوو ، بەم سیفەتەشی ئێمەی زۆر پەست ئەکرد . بەلام هەندێکمان هەرەمەکی‌یانە ئاگاداری ئەوە بووین کە ئەوکورە لەوانەیە بیانوویەکی ماقووڵی بووبێت بەرامبەربەم رەوشتەی . تۆ بڵێی ئەو هەمووزیرەکی‌و هۆشیاری‌یەی کەئەوکورە شانازی پێوە دەکرد شتێکی پووچەڵ‌و بێ‌بناغە بووبێت ؟ بەهەموو شتێ قوربانی دابوو تەنها لەپێناوی ئەوەدا کەببێ بەنووسەر . ئەوەندەبڕوای بەخۆی بەهێزبوو بەجۆرێك کەکاری کردبووە سەرهەندێك لەهاورێکانی . ورە بەرزەکەی ، گورج‌و گۆڵی‌و چالاکی‌یەکەی ، بڕوابەهێزەکەی بە دوارۆژ ، ئەمانە هەموویم بیردێتەوە هەرگیز لەوە نەئەچووو نەدەشیا کە ئەم ڕیش سوورە هەمان مرۆڤ بێت ، بەلام لەگەڵ ئەمانەشدا تەواو دڵنیابووم کە هەر خۆیەتی .

هەڵسام پارەی خواردنەوەکەم داو ڕۆیشتم تا لەگۆرەپانەکە بیدۆزمەوە . فکرم وروژا وو تێکەڵ‌و پێکەڵ بوو بوو . زۆر دەترسام ، بیرم لەوە دەکردەوەو جارجارە بێ سود پرسیارم لەخۆم دەکرد کەدەبێ چی بەسەرهاتبێ . هەرگیز بیرم لەوە نەکردبوەوە کەئاوا ناخۆشی‌یەکی ترسێنەر بەم ڕۆژەی گەیاندبێ . ئەوەتا سەدەهاو هەزارەها گەنج هەن کەخۆیان بەهونەرەوە خەریك کردوەو چەندەها ئامانجیشیان هەیە ، بەلام زۆربەیان لەگەڵ حاڵە مام ناوەندی یەکەشیاندا هەربەردەوامن‌و تەواویشی دەکەن‌و شوێنێکی گونجاویشیان دەست کەوتووە کە بتوانن بە هۆیەوە لەبرسێتی رزگاربن . ئەمە بوو ناخۆشی‌یە ترسناکەکە . لەخۆم دەپرسی‌و دەم گوت تۆبڵێی هیچ ڕووی دابێت . دەبێ چ هیوایەکی بووبێت‌و پێی نەگەیشتبێ ئاوا بەم جۆرە ڕووخاندوویەتی ؟ دەبێ چ ڕەش بینی‌یەك ئاوا لەژیان بیزاری کردبێت ؟ دەبێ چ خەیاڵێکی لەدەست چووبێت ئاوا بەناخی زەویدا بردوویەتی‌یە خوارەوە ؟ پرسیارم لەخۆم دەکردو دەم ووت تۆ بڵێی هیچ شتێکی لەدەست نەهاتایە . ڕۆیشتم‌و بەچواردەوری گۆرەپانەکەدا سووڕامەوە لە ڕارەوەکە نەبوو ، هیچ هیوای ئەوەشم نەبوو کە لەناو قەرەباڵغی‌یەکەی دەوری مۆسیقاژەنەکان بیدۆزمەوە .

دنیا ووردە ووردە تاریکتر دەبوو ، منیش لەوە دەترسام ئیترنەی‌بینمەوە . لەو کاتەدا کە بەلای کەنیسەکەدا تێ‌پەڕیم سەیرم کرد لە سەر قادرمەکانی کەنیسەکە دا نیشت بوو . ناتوانم پێتان بڵێم کەچەند کەساس‌و غەمبار دیار بوو . ژیان بە مقاشە ئازاردەرەکانی ، پەل پەل دڕاندبووی‌و لەوێ بەجێی هێشتبوو ، تەواو ڕووخاندبووی‌و ڕەش بینی کردبوو ، لەسەر قادرمە بەردینەکانی کەنیسەکە فڕێی دابوو . منیش چووم بۆلای‌و پێم ووت !

ها ڕۆمات دێتەوە یاد ؟ بەلام ڕیش سوور هیچ نەجوولا . هیچ وەلامیشی نەدایەوە . هیچ تێبینی‌یەکی لەسەرم نەبوو تەنها ئەوە نەبێت کە بەرامبەری وەستاوم ، سەیریشی نەدەکردم . بە چاوەشینەکانی جارێ سەیری ئەو بازانەی دەکرد کەدەیان چریکاندو جارێکی‌تر سەیرێکی ژێرەوەی قادرمەکانی دەکرد . منیش نەم دەزانی چی بکەم ، دەستم کرد بە گیرفانم‌داو پارەیەکی کاغەزی زەردم دەرهێناو خستمە ناو دەستی‌یەوە ، بەلام ئەو هیچ سەیری پارەکەی نەکرد ، تۆزێ دەستی جوڵاندو بەپەنجە شێوە چرنووکەکانی پارەکەی خڕکردەوەو وەك‌و تۆپێکی بچووکی لێ کردو ئەمجا بە پەنجەگەورەی پتێکی لێ داو فڕێی دایە خوارەوەو بەبەینی بازەکاندا کەوتە خوارەوە ، منیش هەر لەخۆمەوە ڕووم وەرگێڕا ، سەیرم کرد یەکێك لەبازەکان بەدەنووك گرتی‌یەوەو ڕۆیشت‌و دووبازی تریش بەدوایدا دەیانچریکاندو ئەوانیش دوای کەوتن . کاتێ کە ئاوڕم دایەوە سەیرم کرد کابرای سواڵکەر لەوێ نەمابوو ، سێ ڕۆژی تریشم لە ڤێراکۆز بەسەربرد ، بەلام کابرای ڕیش سوورم هەر نەبینی‌یەوە .

سەرچاوە :

Collected Short Stories .
Somerset Maugham
Volume Two

بەشی یەکەم

گۆڕین و ئامادەکردنی
کمال جلال غریب

# تۆمارگەی بووبەردەکان

## «سجل الحفریات»

واتا کلیلی دیرزەمان = Fossil record

زاراوەی (بووبەرد) کەبەرامبەر بە احفور = متحجر = مستحاث دێت لەزمانی عەرەبیدا بریتیە لە پاشماوەیان شوێنیواتا ( باسمەیان دامغەی ) imprints ئەوزیندەوارانەی Creatures (گیانداربێت یان ڕووەك) کەڕۆژێك لەڕۆژان لەزەویدا ژیانو لەچینە کەڤرە (صخور Rocks) یەك لەسەر یەکەکاندا بووبن بەبەرد بەجۆرێکی ئەوتۆ کەبووبن بەتۆمارگەیەك (بڕوانامەیەك) بۆ مێژووی ژیان لەسەر زەوی . تەنانەت شوێن پێو شوێنی خشانو کونکردنی شتومەكو تەرسو شیاکەی Coprolites ئەو گیاندارانەشی هەر بەبوو بەرد دادەنرێن .

خوێندنو لێکۆڵینەوە لەبووبەرد هەندێك زانیاریمان دەداتی دەربارەی شێوەکانی ژیان شوێنەوەرەکانی وەختە دێرینەکان . وا قە بلێنراوە کەکێشی هەموو ئەو زیندەوەرانەی کەلەسەر زەوی ژیاون لەچاخی کامبرییەوە هەتائێستا یەکسانە (دەکاتە) بەبارستایی خڕۆکی زەوی .

زۆربەی مادەی ئەندامی (زیندەگی) بەشێوەیەکی بنچینەیی لەزیندەوەرە مردووەکانەوە دەچنە زیندەوەرە زیندووەکانەوە ، لەگەڵ ئەوەشدا بەشێکی یەکجار کەم لەزیندەوەرە دێرینەکان بوونەتە بوو بەردو لەچینەکانی زەویدا بەداپۆشراوی پارێزراون . تەنها ئەو زیندەوارانە بەشێوەی بووبەرد پارێزراون کەپەیکەرێکی ڕەقو قایمیان هەبووە . زوربەی زۆری گیاندارە بێ بڕبڕەکان Inverte brates پەیکەرێکی کلسی calcaneous یان سەدەف (لەپکە) یان هەیە وەکو شیلان (مرجان corals) و نەرمۆلەکان (نواعم mollusks) وپێ بازوویییەکان (عضدیات الارجل brachiopods) پێ بازوویییەکان کۆمەڵە گیاندارێکی بێبڕبڕەی دەریایین دوو سەدەفیان هەیە لەگوێچکەماسی دەچن ، وەکو.

ونەرمۆڵەکان (نواعم mollusks) وەکو شەیتانۆکەو 2 پێ بازوویییەکان (عضدیات الارجل brachiopods)[3] وەکو حەسیری دەریا[4] (حصیرة البحر sea mat = Bryozoo) . هەندێك شێوەی تریان سەدەفەکەیان لەفۆسفاتی کالسیوم ( ئەم مادەیە لەئێسکی گیاندارە بڕبڕە دارەکاندا هەیە ) یان لەدووەم ئۆکسیدی سلیکۆن پێکهاتووە . پەیکەری گیاندارە پێجومگەییەکان (فصلیة الارجل Arthropoda) لەمادەیەکی ڕەق پێکهاتووە پێیدەووترێت کایتین (chitin) کە بەهۆی خوێی کانزاییەوە پتەوبووە . ئەو بەشە ڕەقانەی لەش زیندەوەرەکان کەدەبن بەژێر قوڕو لیتەی نیشتووەوە sediments دووچاری گۆڕان دەبن بەدرێژای ئەوماوەیەی کەقوڕو لیتەکەی تیادا دەبێت بەکەڤرێکی ڕەق ـ گیراوە (محلول solution) کونی

ئەوسەدەفو ئێسکانە پڕدەکەن بەخوێی کانزایی ، واتا پاشماوەی ئەوزیندەوەرانە دەکەن بەبوو بەرد دەشێت هەندێك بەشی ئەو بووبەردە بەکاری پەستان لەناوبچێت یان دەشێت لەهەندێك باری تردا ، گیراوە ترشەکانی ناوزەوی سەدەفە (لەپکە) بنچینەییکە بتوێننەوە بەشێوەی بۆشاییەکی کراوە بەجێی بهێلن ، لەگەڵ ئەوەشدا ، دەشێت کەگیراوە کلسییان سلیکییەکان مادەی تازە لەو بۆشاییانەدا بنیشێنن ، ئا بەم پێکهاتە دروزنەیە (ناڕاستەقینەوە) سەدەفێکی تازە پەیدا دەبێت . بەدەگمەن بەشە نەرمەکانی گیانداروڕووەکەکان دەمێننەوە (واتا دەپارێزرێن) و بەناو بانگترین نموونەش بۆ ئەمانە بوو بەبەردەکانی چاخی کامبری cambrian لە کەنەداو چاخی سێهەم Ter tiary کەلەجیسیلتال لەئەلمانیادا بینراون نقوم بوونی مێروولە بەردی کارەبادا (کهرمان Amber) نموونەیەکی نائاسایی‌ترە بۆ پاراستنی بووبەرد دەدا =



△ فیلێکی مـامـوث mamoth

( مەگەر باکتریـانا هـەوایی‌یەکـا anaecobic کاری خـۆیان لەو بووبەردانە بکەن ) .

لێکۆڵینەوە لەچۆنێتی‌مان‌و پاراستنی ئەو بووبەردانـە گەلێـك زانیـاریی بنچینـەیـی‌مـان دەداتێ دەربـارەی مـۆلگـەی بووبەردەکـان‌و زانیاری شـوێنەوارە دێـرینەکـان paleoecology وزانیاری جوغرافیای دێرین paleogeography و گۆڕانە گرنگەکانی ئاوو هەوا .

یـەکەم بـووبەردی دۆزراوە چـووزەوارە (قەوزە) یـەك بووە کەتەمەنی (2700) ملیۆن ساڵ بووە ، لەسەر دەمە کـۆنەکـاندا بووبەرد هەر هەبووە بەلام مرۆڤ لێیان تێ نـەگەیشتـوون . (هیرۆدتس) کەمێژوو ناس‌و گەڕیدەیەکی یۆنانی کۆن بووە وای بەبیردا هـاتووە کـەئەو گیـاندارە فـۆرامیـنیفیرا ) foraminiFer ( شانۆ چکدار = منخریات ) گەورانەی کەلە بەردە قسڵەکانی ئەهرامەکانی میسردا پارێزراون پڕیتین لەپاشماوەی ئەو دەنکە نیسکانەی کەلەکاتی خۆیدا بەشێوەی خۆراك بەوکـریکارانـە دراون کـە ئەهـرامەکـانیان دروست دەکـرد . بـەلام زانـاو فەیلەسوفە ئەغـریقی‌یەکـان بەر لە سـەدە ناراوەستـەکانـدا خەلکی وا سەیری بووبەردیان دەکـرد کەکـارێکی دەگمەن‌و ئاسایی‌یە لەکارەکانی سروشت‌و واتا یاری‌یەکە لەیاری‌یەکانی سـروشت‌یان شـەیتان کـردە هونـەرمەنـدی مەزن (لیـونارد دافنشی) یەکەم کەس بووە کـەلە راستـی‌ی نەژادی بـووبەرد گەیشتووە . راستی‌و سوودی بووبەردەکان هـەر بەشێـوەی مەتەل (نهێنی) مایەوە هەتاوەکوو کۆتایی سەدەی هەژدەهەم ئەوەبوو ئەندازیار (ولیم سمیث) دەری خست کەبوو بەردی ناو چینە کەڤرێکی تایبەتی جیاوازە لەبووبەردی چینە کەڤرەکانی هـاوسێ‌ی . ئەوەنـدەی پێ نـەچـوو لەسـەرەتـای سـەدەی نۆزدەهەمدا زانیاری بـووبەردەکـان ( علم الاحاثـة = علم الحفـریات = Paleonlology) بـەشێوەی یـەکێك لەزانیـاری‌یە گرنگەکانی زەوی هاتەکایەوە . هەتـا ئیمرۆ دوو سـەد هەزار گیانداری بوو بەبەردکراوە ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە تەنها بەشێکە لەو ملیۆنەها گیاندارو ڕووەکانەی ، کەلەوەختی جیـاوازدا ، لەماوەی سێ هەزار ملیۆن ساڵدا لەسەر زەوی ژیاون . خوێندنی بـووبەرد لەسـەرەتادا خـوێندنێکی بـایۆلۆجی‌یـە (زانیـاری زیندەوەر) چونکـە زانینی شێوەو پێکهـاتنی گیانـدارێك یـان ڕووەکێکی تایبەتی بەستراوە بەتێگەیشتن لەشێوە زیندووەکانی ئەوگیاندارانەیان ئەوڕووەکانە .. بەهووی بووبەرد دەشێت کەلەو گۆڕانانە بگەین کەلەژیانـدا لەچـاخە دوورو درێژەکاندا ڕوویان داوە . بووبەرد سوودێکی گرنگی هەیە لەتۆمارکردنی ئەورووداوانەدا کەلەمێژووی زەویدا هاتوونەتە ئـاراوە . هـەرچـاخێـك لەچـاخـەکـانی خشتـەی وەختـە جیولۆجی‌یەکـان[5] کۆمـەڵە گیانـدارو ڕووەکی تایبـەتی خۆی هەبووە . دەشێت ئەو کۆمەڵە بووبەردە لەیەکچووانەی کەزۆر هەن لەنیشتەنی‌یە جیاجاکاندا لەیەك وەختـدا بووبن ( واتـا پەیوەندی وەخت لەنێوانیاندا هەبووبێت ) ، ئەمانە سنووری تایبەتی بـۆزانیاری چینـەکانی زەوی بـەدیار دەخـەن . بوو بەردەکان جگە لەوەی کەسـوودیان هـەیە لەئـاشکرا کـردنی پەرلەی (شفرة) مێژووی جیولۆجی زەویدا ، سوودیشیان هەیە لەمەیانی دۆزینەوەی مەعدەن‌و ڕۆنە مەعدەنی‌یەکان (پەترول) هەروەها سوودیان هەیە بۆبڕیاردانی شوێنی کانە خەلۆزەکان لەناو چینەکانی زەویدا ، لەم ساڵانەی دواییدا لەڕێگەی ئەوبوو بـەردانەی کـەکەوتـوونەتـە ناخی شیـوو دۆڵە قووڵەکـانەوە خـوێندن‌و لێکۆڵینـەوە لەسـەر پتـرۆڵ‌و عـەمـارە (مـۆلگـە) غازی‌یەکانی ناوچینەکانی زەوی کراوە بەشەرەقەکانی لەش ، وەکوئێسك‌و سەدەف ، هەرچەندەکە وێنەیەکی تەواونین بۆئەو گیاندارە کۆنە ، بەلام لەگەڵ ئـەوەشدا یـارمەتیمـان دەدەن لەخـوێندنی هـەموو ڕەوشت‌و پێکهـاتنی ئـەو گیـاندارەدا . ئـەویارمـەتی‌یـە زۆر گـرنگـە بۆ دانـانی خشتـەی وەختـە جیـولۆجی‌یـەکـان‌و دابـەش کـردنی ئـەو وەختـە بـۆچـاخ‌و سەردەم ..... هتد ، لەبەرئەوە ئەم جۆرە بووبەردانە پێیان دەوترێت بووبەردە ڕابەری‌یەکان (حفریات دلیلیة) Index fossils چونکە ڕابـەرێکی بۆ ئـەوچاخـەیان سـەردەمەی کـەتیایـدا دۆزراونەتەوە لەئەنجامی پشکنینێکی زۆرە وەلە نـاوچەکـانی زەوی‌دا دەرکەوتووە تازە ترین چینی کەڤری سەرەوە جۆرەها بووبەردی ئەوتۆیان تێدایە کەزۆرکەم جیاوازی‌یان هەیە لەگەڵ

ئەوانەدا کەئێستا لەسەر زەوی یان لەناو دەریاکاندا دەژین و هەتاوەکو بەناخی زەویدا بچینە خوارەوە بەرەو چینە کۆنەکان و هەرەکۆنەکان دەبینین کەکەم و کەمتر لەم جۆرە گیاندارە قرتێ کەوتووانەیان تێدایە کە ( ئێستاکە بەهیچ جۆرێک نین ) . زاناکانی بووبەرد واتا بووبەرد ناسەکان ( عالم احاثی paleontologist) لەئەنجامی لێکۆڵینەوەی ئەو بووبەردانەی کەلەچینە کەڤرینەیەك لەدوای یەکەکاندا هەن بۆیان دەرکەوتووە کەجۆرە جیاوازەکانی ئەو بووبەردانە ، بەدرێژایی تێپەڕبوونی وەختە جیولوجی یەکان ، گۆرانی گرنگیان بەسەر داهاتووە ئەگەر ئێمە دوای ئەم گۆرانە لەجۆرەگیاندارێکدا (یان لەچەند جۆرێکدا) بکەوین ، یان تۆژینەوە لەو گۆرانانە بکەین کەبەسەر سروشتی کۆمەڵەی گیاندار (المجموعة الحیوانیة faum) یان کۆمەڵەی رووەك (المجموعة النباتیة flora) داهاتووە ، دەتوانین لەسەر بنچینەی ئەوگۆرانانە خستەیەك دابنێین ، بەرلەوەی نموونەیەکی ئەوتۆ بهێنینەوە کەرێگەی بووبەردو بەکارهێنانی لەدانانی خشتەی وەختی جیولۆجیدا روون بکەینەوە واباشە بەشێوەیەکی ساکار باسی ئەو گیاندارانە بکەین کەبە شێوەی بووبەرد هەن ، گۆرانی شێوەی قاقلەی قوقعە گیاندارە نەرمۆلەکان ، بەپێی وەخت ، لەچینە نیشتەنی یە یەك لەدوای یەکەکاندا ، باشترین نموونەش بۆ ئەمە : -

بووبەرد ناسەکان دیویانە کەئەو قاقلانەی لەچینەکانی هەرە ژێرەوەی زەویدا هەن (واتا چینەکۆنەکان) شێوەی قوچەکێکی (مخروط) راستیان هەیە ؛ کەچی قاقلەکانی ناو چینەکانی سەرووی ئەوان (واتاچینە تازەکان) شێوەیەکی چەماوەیان هەیە ، هەروەها هەتا بەرەو چینەکانی سەروتر (تازەترەکان) بروین شێوەی قاقلەکان زۆرتر چەماوە دەبێ بەجۆرێکی ئەوتۆکەپێچەکەی (لفّة) دەرەوە هەموو پێچەکانی تر دادەپۆشێت . لەم نموونەیەدا دەبنیین کەوا دەتوانین ئەو وەختە دابەش بکەین کەتێپەڕبووە بەسەر ئەوگیاندارە قاقلە ساکارەدا هەتا گەیشتۆتە شێوەی گیاندارێکی قاقلە ئالۆزو ئەم وەختە بەملیۆنەها ساڵ دەقەبلێنرێت[6] . بەم جۆرە دەتوانرێت وەختەکەش بکرێت بەچاخو سەردەمو سەدەوە بەپێی ئەم ماوەیەی کەهەر شێوەیەك لەشێوەکانی قاقلەکە دەیخایەنیت گرنگیش لەو خوێندنەدا ئەوەیە کەئەم گۆرانانە تەنها لەیەك شوێن یان لەیەك ناوچەدا روویان نەداوە بەڵکو بەهەمان دوا بەدوا لەهەموو بەشەکانی خڕۆکی زەویدا روویان داوە واتا لەهەموو ئەو بەشانەدا کەپاشماوەی زیندەوەر لەچینەکانیاندا هەیە ئینجا بۆ ئەوەی کەزیندەوەرێك ببێت بەبوو بەرد دەبێت دوو مەرجی بنچینەیی هەبێت : -

1 – دەبێت ئەو زیندەوەرە پەیکەرێکی رەقی هەبێت کە بە ئاسانی نەرزێت وەکو سەدەفو قاقلەو ئێسكو ددان ... هتد چونکە بەشە نەرمەکانی وەکو پێستو بەزو کرکراگەو چاوو هەناو خێرا دەفەوتێن لەئەنجامی رزین و شێ بوونەوەو هیچ چۆرە شوێنکاریکی یان (اثر) لەدوا بەجێ نامێنێت مەگەرلە هەندێك نموونەی بەدەگمەندا نەبێت ، ئەویش وەکو لەکاتی پاراستنی گیاندارردا لەناو ئەو توێەلە سەهۆڵینانەدا کە بەدرێژایی ساڵ ناتوێنەوە یان نموونەی پاراستنی گیاندار لەناو زەمقە (جەوی) رووەکی یەکان یان لەکارەبادا (کهرب = کەهرەمان Amber)[7] . وەکو نقووم بوونی هەندێك مێروو لەکارەبادا .

2 – پاراستنی زیندەوەر دوای مردنی پێویست بەکردارێکی نیشتنی بەردەوام دەکات . زۆربەی ئەو زیندەوەرانەی کەلە ئاودا دەژین دوای مردنیان لەبنی ئاوەکەدا نقووم

ئەتریپا (Atrypa) گیاندارێکی بێ بازوویی بووە لەچاخی سیلوری یەوە .



دەبن ، ئینجا لێرەدا تووشی دوو بار دەبن : یان بەشەیەکیدا نەپۆشراو دەمێننەوە ئەو ساکە دووچاری رزین دەبن بەهۆی باکتریای ئاوییەوە یان بەچینێکی نیشتەنی (ئەوقورو لێتەیەی کەلەئاوەکەدا بەردەوام دەنیشێت ) دادەپۆشرێت و ئەو چینە لەرزین و فەوتان دەیپارێزێت . شوێنەواری یە ئاوییەکان (البیئات المائیة) باشترین گۆرستانن بۆ گیاندارەکان ئەگەر لەگەڵ شوێنەوارە ووشکانی یەکاندا بەراورد بکرێن ، چونکە ئەگەر گیاندارێك لەسەر زەوی (ووشکانی) بمرێت بەبەرەڵلای دەمێنێتەوە هەتا دەرزێت وای لێدێت کەشتێکی ئەو توی لێنەمێنێتەوە .

چۆنێتی و پاراستنی زیندەوەر ، دوای مردنی ، بۆئەوەی بووبەردی لێپێکبێت ، بەیەکێك لەم رێگەیانە دەبێت .

**1 – نێژران واتا بوون بەژێرگلەوە (الزمن Burial)**

لەم رێگەیەدا گیاندارە تازە مردووە لەبەچینێك قورو لیتەی تازەیان سەهۆڵی کەلەکەوەبوو دادەپۆشرێت ، بۆنموونە : لاشەی هەندێك لەوفیلە کۆنانەی کەپێیان دەووترێت ماموث لەناوچەی سیبریا بەساغی دۆزراونەتەوە بەتوێك و گۆشت و خوێنەوە تەنانەت ئەو خواردنەی کە خوار دووشیانە لەوکاتەدا هەرلەسکیانا ماوەتەوە هەر چەندە کەزیاترلە ملیون ساڵ سەر مردنەکەیاندا تێپەربووە . بۆسەیر دەیگێرینەوە کەوا یەکێك لەو تیپانەی کەوەختی خۆی نێرراون بۆپشکنینی بۆلی باکوری رێیان لێوون دەبێت و خواردەمەنی یان پێنامێنێت لەپرێکا لاشەیەکی بەستووی (متجمد) فیلێکی ماموث mamoth دەدۆزنەوە ئەمانیش لەبرسا پەلاماری دەدەنی و دەبینن کەگۆشتەکەی هێشتا هەر تازەیە ، هەر چەندە کەملیۆنێك ساڵ بەسەر مردیندا تێپەربووە لەناو سەهۆلەکەدا .

**2 – جێگرتنەوە (الاحلال Replacement)** : دوای ئەوەی کەزیندەوەر دەمرێت بۆگەن دەکات و بەشە نەرمەکانی لەشی شێدەبنەوە ، بەلام پەیکەرە ئێسکییەکەی هەر دەمێنێتەوەو بەرهەلستی کاری شێ بوونەوە دەکات ، هەندێك جار هەندێك لەو مادە مسلێیان دەباشیرییان ئاسنینییان سلیکییانەی کەلەئاوەکەدا هەن بەهێواشی و بەشێوەیەکی کەم جێگەی



میکرا ستەر (micraster) جۆرێك بووە لەژیشکی دەریا لەچاخی دەبا شیرییەوە (cretaceous) .

هەندێك لەبەشە نەرمەکانی پەیکەرە رەقەکەی گیاندارە مردووەکە ( یان قەدی رووەکە مردووەکە ) دەگرنەوە ، بەجۆرێکی ئەو تۆکە زۆر جار شێوەی دەرەوەی ، تەنانەت پێکهاتنی خانەیی ئێسکەکان وەکوو خۆیان بەساغی دەمێننەوە بەم جۆرە بوو بەردی ئاسنینییان سلیکییان گەچی چەندەها زیندەوەر (گیاندارو رووەك) پەیدا بوون .

**3 – قالب و دارشگە یان هۆرو قالب (الطابع والقالب caerts and moulds) : –**

زۆر جار بەشە رەقەکانی گیاندارەکە وەکوو : قاقلەو لەپکە ، یان رووەکەکە وەکو : تەختە ، بەتەواوی دەفەوتێن بەهۆی توانەوەیان لەئاوەکەداو هیچ بەجێ ناهێڵی مەگەر قالبە دەرەکییەکەیان نەبێت کەبەشێوەیەکی بۆشی لەناونیشتەنییەکاندا دەمێنێتەوە . جائەگەر ئەو قالبە پربکرێت لەمۆم ئەوا دیمەنی دەرەوەی ئەوگیاندارەمان بۆ دەردەکەوێت کەلەوە پێش ژیاوە . بەلام هەندێك جار بەر لەوەی کەگیاندارەکە ، بۆ نموونە شەیتانۆکەیان گوێچکە ماسی دابخورێت (تآکل) ئاو هەموو هەناوەکەیان لادەبات و دەبێتە هۆی نیشاندنی مادەی کانزایی لەپەیکەرە بۆشەکانیاندا ، جا ئەگەر هاتوو لەبەر هۆیەکی تایبەتی پەیکەرە دەرەکییەکە فەوتا ئەوا ئەو قالبەی ناوەوە کە لەمادەی کانزایی پێکهاتووە باسێکی گرنگمان دەداتێ دەربارەی ئەو گیانەوەر . بووبەرد گەلێك جۆری هەیە بۆنموونە : بووبەردی شوێن پێی مرۆف یان گیاندار لەسەرزەوی نەرم کەوردە وردە رەق دەبێت و دەگۆرێت بۆکەفر . بەم جۆرە شوێنکارانە دەڵێن شوێنکاری زیندەگی .



جوریك لەڕووەك لەچاخی كاربۆنی یەوە (carboniferous)

**4 – نیشاندن** (Deposition) : ـ هەندێك لەو ئاوە كانزایی‌یانەی كە خوێیان زۆر تێدایە دەشێت كەخوێ یەكانیان لەسەر پاشماوەی ئەوگیاندارو ڕووەكە مردووانە بنیشێنو بەرگێكی كانزایی قایم بەدەوریاندا دروست بكەن بەجۆرێكی ئەوتۆ كەبیان پارێزێت .

**5 – خەلۆزاندن = كاربۆندن (تفحم = كربنة** carbonisation : ـ هەندێك جار ئەوڕووەكو گیاندارانەی كەدەبن بەژێر زەوی‌یەوە ، بەرە بەرە بەشە نەرمەكانیان ئۆكسجینو نایترۆجین وون دەكەن بەمە ڕێژەی كاربۆنیان تیادا پتر دەبێت ، كەوابوو كرداری خەلۆزاندن ڕوودەداتو زیندەوەرەكە بەچینێكی كاربۆنی (خەلۆزی) ئەوتۆ دادەپۆشرێت كەڕوالەتی (مظهر) زیندەوەرەكەی تیادا دیارە .

**6 – چاپی (دافعەی) شوێنكاری زیندەوەرەكە (طبع آثار الكائن الحی)** Impressionand Imprint : ـ لەوەپێش ووتمان كەهەندێك گیاندار شوێن بەجێ دەهێڵێت ، وەكو شوێن پێ ، لەسەر زەوی‌یەكی نەرم یان قوڕانی ، ئینجا وردە وردە ئەو شوێن پێ‌یە ڕەق دەبێت وەكو بەردی لێدێت . هەروەها كەهەندێك جار گەڵای ڕووەك دەوەرێتو دەكەوێتە سەر شوێنێكی نەرمی وەكوو قوڕو لیتەیان لمانی چاپی ئەوگەڵایە لەسەر ئەو زەوی‌یە دەردەچێت . كەگەڵاكەی خۆی دەڕزێت شوێنەكەی بەچاپكراویی لەسەر قوڕەكە دەمێنێتەوە ئینجا بەرە بەرە ڕەق دەبێتو دەبێتە بوو بەردێك بۆ ئەو جۆرە گەڵایە . خوێندنی ئەوزیندەوەرە بوو بەردانەی كەبەر لەسەدەی ئێستاماندا ژیاون دوو مەبەستی تیادایە : ـ یەكەمیان مەبەستێكی بایولۆجی یەكە ئەویش زانینی مێژووی ژیانی زیندەوەرەكانو بنچینەی ژیانو چۆنێتی گۆڕانێتی لەسەرەتای وەختە جیولۆجی‌یەكانەوە هەتا ئێستا . مەبەستی دووەمیش جیولۆجی‌یە ، كەئەویش زانینی مێژووی خڕۆكی زەوی‌و دەرخستنی ئەو دیاردەو گۆڕانە یەك لەدوای یەكانەیە كە بە تێپەر بوونی وەخت بەسەریدا هاتوون ، جگە لەخوێندنی شوێنەوارە بایولۆجی‌یە كۆنەكانو چۆنێتی دابەش بوونی بووبەردەكان لەسەرزەوی‌و بارەكانی ئاوو هەوایە لەو وەختە جیۆلۆجی یانەدا . بوو بەرد دەست كەلایەكی بنچینەیی ئەو تۆیە كەلەلایەن ڕەچەڵەك ناسەكانەوە (زاناكانی ڕەچەڵەك) (علماء الانساب Geneologist) ← بەكار دەهێنرێت بۆ زانینی ئەو گۆڕانانەی كەبەسەر ڕەچەڵەكی زیندە وەرەكاندا هاتوون .

مەرج نی‌یە ئەو بوو بەردانەی كەلەزوربەی ناوچەكانی خڕۆكی زەویدا هەن لەیەكتری بچن ، چونكە مەرج نی‌یە هەمان گیاندارو ڕووەك لەزوربەی ناوچەكانی خڕۆكی زەویدا هەبووبن سەرەڕای ئەوە زانینی بووبەرد یارمەتیمان دەدات لەدەست نیشان كردنی تەمەنی ئەوچینانەی زەویدا كەبووبەردەكانیان تیادایە ، ئەمەش دەبێتە هۆی زانینی ئەوەی كەئایا دوو چینی زەوی هەر چەندێك دووربن لەیەكتری‌یەوە سەر بەهەمان چاخ یان سەردەمن یان‌نە ؟ دەبێت ئەوەش بزانین كە بە شێوەیەكی گشتی هەموو بوونە بەردێك (تحجر Fossilization) گۆڕانی كیمیایشی لەگەڵدایە ، چونكە ئاوە جووڵاوەكان (سوڕاوەكان) مادە كیمیایی‌یەكان دەتوێننەوەو بەهینی تر دەیان گۆڕنەوە

(واتا مادەی تر لەشوێنیان دەنیشێنن) وەکو مادەی سلیکا silica و کاربۆناتی کالسیوم calcium carbonate و ئاوێتەکانی ئاسن . هەندێك جار مادە جێگرەوەکە Replacement پەیکەری زیندەوەرە بنچینەیییەکە دەپارێزێت . زۆر بەدەگمەن رووەدەدات کەمادە نیشتەنییەکان ببنە هۆی پاراستنی شانە نەرمەکان ، بەڵکو بە زۆری تەنها بەشە رەقەکانی لەشی زیندەوەر دەپارێزن هەندێك لەبوو بەردە دێرینەکان بریتین لەقەوزەی سەرەتایی و باکتریا bacteria .

بەلام ئەو بووبەردی ماسییەو لولەبییەی (قندیل البحر = سمكة هلامية jilly fish) و كرمانەی كە لەكەڤرەكانی ئوستراليادا بینراون تەمەنیان بە (1000) ملیۆن ساڵ دەقە بلێنرێت جگە لەپاراستنی زیندەوەر بەهەر شێوەیەك بێت دەشێت كە چالاكی زیندەگیش (زیندەوەریش) هەر ببێت بەبووبەرد بۆ نموونە وەکوو جێگەپێی دینۆسۆرەکان (دیناصورات dinosaurs) و پاشماوەی ئەو کون و کەلەبەرو هێلانانەی کەلەلایەن گیاندارەوە دەکرێت . بووبەرد بۆ نووسینی مێژووو زانینی پەیوەندی نێوان کەڤرەکان بەکار دەهێنرێن ، جگەلەوەی کە وێنەیەکمان دەدەنێ دەربارەی باری ژیانی کۆن و ئێستاش . بەر لەوەی کە هەرە دێرینی ژیانی دیار (ابدأ الحياة الظاهرة = phanerozoic دەست پێبکات واتا لە (600) ملیۆن ساڵ لەمەوبەرەوە ، ژیان زۆر ساکار بووەو بوو بەردیش بەدەگمەن هەبووە . تەنها یەك لێکدانەوەش هەیە بۆ ئەمە : هەتا چاخی کامبری Cambrian Period لەکەشدا (جوّ atmosphere) ئەوەندە زۆر نەبووە کەبەش بکات بۆگەشە پێکردنی ئەو گیاندارانەی کەدەشێن ببن بەبوو بەرد . لێرەدا ناوی هەندێك بوو بەرد پێشان دەدەین : -

1 — دیکنسۆنیا (Dickinsonia) کرمێك بووە لەچاخی بەرلە کامبرییەوە ( ماقبل الكامبري precambrian )

2 — دالمانیت (Dalmanites) گیانداریکی سێ پل بووە ( ثلاثي الفص Trilopate ) لەچاخی سیلورییەوە (silurian)

3 — میکرا ستەر (micraster) جۆرێك بووە لەژیشکی دەریا لەچاخی دەبا شیرییەوە (cretaceous) .

4 — داکتیلیو سیراس (Dactylioceras) جۆرێك بووە لەگیانداری (ئەمۆنیت) لەچاخی جۆراسییەوە (jurassic)

5 — ئەلیثو پیتریس Alethopteris جۆرێك بووە لەرووەك لەچاخی کاربۆنی یەوە (carboniferous) .

6 — ئەتریپا (Atrypa) گیانداریکی پێبازوویی بووە لەچاخی سیلوری یەوە .

7 — فەسەس (فوسوس) Fusus گیانداریکی نەرمۆڵە (mollusc) بووە لەکۆمەڵەی شەیتانۆکە .

8 — کاردیەم (cardium) گیانداریکی دوو لەپکەی (دوو سەدەفی) یە لەچاخی ترپاسییەوە (Triassic) ئێستاش هەیە .

9 — دایدیمۆ گراپتەس Didymograptus جۆرێکە لەگیانداری گراپتۆلیتەکان Graptolite لەچاخی ئۆردۆ ڤیسییەوە (ordovician) .

10 — لیثۆستروشن lithostrotion گیانداریکە لەکۆمەڵەی شیلان (مرجان = coral) لەچاخی کاربۆنییەوە Carboniferous .

11 — ماسی بوو بەرد Fossil Fish لەچاخی ئیوسینەوە (ایوسین = Eocene) . = ماویتی =

## 1 - تۆماری بووبەردەکانی بەرلەکامبیری :
: Pre Cambrian Fossil record

کەمی بووبەرد لەدێرینی بەرلەکامبیریدا ، بۆماوەیەکی زۆر ، وەك مەتەڵێك وابوو بەلایەن زاناکانەوە ، نیشتەنییەکانی (ترسبات) بەرلەکامبیری ، بەتایبەتی ، بەردی قسڵو (حجر الكلس lime stone) دۆلۆمایت و Dolomite ستروماتۆلیت stromatoltes



زیندەوەرە تاك خانەکان (Protista)

یـان تێدابـوو ، ئەم زینـدەوەرە چین چینـانەی کـەلەشێوەی گـومەزی دابـوون لەم دێرینـەدا زۆر باو بـوون . تـەمـەنی کۆنترینیان بەزیـاترلە (2) هـەزار ملیون سـال دەقەبلێنـرێت . دەشێت تەبەقە تەنکەکەی لەشیان لەلایەن قەوزەی سەوزی مەیلەو شینەوە نشێنرابێت . لەم سالانەی دواییدا ، زانیاری مرۆڤ دەربارەی ژیانی بەر لەکامبری گەلێك فـراوانتر بـوو ، نەوەك تەنها هەر لەبەر ئەوەی کەزیندەوەری باش پارێزراوی تازە دۆزراونەتەوە ، بەلکو بەهۆی خوێندنی ئەو ئاوێتە ئەندامی یانەوە (عضـوی organic) کە لە ئـەنجامی رزینی زینـدەوەری مردووەوە پەیدابوون . ئەم ئاوێتانە پێیان دەووترێت بووبەردی کیمیایی (المتحجرات الکیمیاویة) (chemico fossils) .

گرنگترینی ئەمانەش بریتین لەمادەی ئەلکانە ئایزۆ پرینۆیدەکان Iso prenoid alkanes کـە گوایـا بریتـین لەبەر هـەمی ئـەنجـامی تێکشکانی کلوروفیل chlorophyll . نمونەی ئەمانە کە لەپێکهـاتە ئاسنینەکـەی ناوچـەی سوودان و Soudan مینیسـوتا Minnesota داهـەن تەمـەنیان نـزیکەی (2800) ملیـون سالە . ئـەو بەردە ئەستێیەی (حجر الصوان chirt) کە لەناوچەی ئونتاریۆ Ontario لە کەنەدا هەیە کـونترین بـووبەردی دێـرینی بەر لەکـامبری تیادایە . ئەم بووبەردە ووردانە لەلایەن زانایان : تایلەر Tyler و براگهوورن Braghoorn وەلەسالی 1904 دا دۆزراونەتەوە ،لەبەردە ئەستێیەکی رەنگ تۆخدا کە دەورویشتی سترۆماتۆلایتەکانی داوە ، لەناوچەی پێکهاتە ئاسنینەکاندا (Iron formations) تەمەنی ئەو پێکهاتە ئاسنینانە (کانەئـاسنانـە) بە (1900) ملیـون سال قەبلێنراوە . زاناکان وایان لێك داوەتەوەکە ئەم بووبەردە باش پـارێزراوانـە بریتـین لە رووەکە ثـالوسییەکـان (الثالوسیـات Thallophytes) وەکــوو چـووزەوارەو (طحلب) وکــەروو (فـطر) باکتریـای دەزوولەیی وقەوزەی سـەوزی شین بـاو Green blue algae . ستروماليتە سلیکا مژیوەکانی Silicified وولاتی کوینزلاندو ئـوستەرالیـا کەتـەمەنیـان (1600) ملیـون سـالە بـووبـەردی زیندەوەری ووردی ئەوتۆیان تیادایە کـە لەقەوزە لینجـەکانی (الأشنات المخاطیة Myxophy Cean algae) ئێستا دەچن . ئەمانە کۆمەلەیەکی سەرەتایین کـەبریتیـە لە سنورێکی جیـاکەرەوە لەنێوانی گیانداراو رووەکدا . لەکەڤری (صـخر Rock) دولۆمایتی نـاوچەی بیـك سپریگنـدا لەکالیفـۆرنیاکـە تەمـەنی لەنێوان (1200 — 1400) ملیون سالدایە قەوزەی سەوزو قەوزەی سەوزی مـەیلەو شین دۆزراوەتـەوە . ئەمـەش ئەوە دەردەخـات کـە لەووەختەدا خانەی (خلیة cell) ناوکداری زیندوو هەبووە . ئەم بـووبەردە ووردانـەی کەبـاشتر پـارێـزراون وەك لەوانـەی کەلەبەردە ئەستێدا هەبوون لەناو سترۆماتولیتە ئەستێکـاندا بووون . هەتا ئێستا باسی زیاتر لە (30) جۆرلە بەکتریاو قەوزەی سـەوزو قەوزەی سـەوزی مەیلەو شـینو زیندەوەری شێـوە کەروو کراوە . کۆمەلە گیانداری ئێدیاکاران Ediacaran لەمۆلگەی (bed) کـەڤـری کـانـزایی کـوارتـزیت Quartsite لەبـاشـووری ئوستەرالیـادا لەسالی 1947 دا دۆزراوەتـەوەو لەم سالانـەی دووایی‌یەدا بەدوورو درێـژی توژینـەوەیان لەسـەرکراوە . وادەردەکەوێت کەتەمەنی مـۆلگەکـە دەگەرێتـەوە بۆکـۆتایی دێرینی بەرلەکامبری یان بۆبەرەبەیانی چاخی کامبری (الحقبة الکامبریة) . ئەو بووبەردانەی کەبەشێوەی شوێنکار واتا دامغە (imprint) لەسەر رووی تاشەبەردە Flaggy کوارتزیتەکان بەباشی چـاپ بوون ، بـریتین لەکـۆمەلەی گیـانداری میتـازوا واتـە (چـەندینـە خانـەکان Metazoa) ، والیـك دراوەتـەوەکـە ئـەم بووبەردانە بریتین لەکۆمەلەگیانداری هایدرۆزوا (Hydrozoans) ، کەلقێکن لەکۆمەلەی گیانداره بۆش ریخۆلەیی یەکان (امعائیة الجوف) و ، قەلەمی دەریا (قلم البحر sea pens) (ئەمیش هەر جـۆرێکـە لەگیـانـدارەبـۆش ریخـۆلەیی‌یـەکـان) و کـرمـە ئـەلقـەدارەکـان (segmentedworms) . واتـاپێ جـومگـەیی‌یـە سەرەتایی یەکانو گیانداری تـری ئەوتـۆ کەهـەتا ئێستـاش بنـەچەیـان نەزانـراوە . ئەو قـەلەمی دەریایی‌یـانەی کـە لە



بووبـەردی سەدەفی 

مۆلگەکانی بەر لەکامبری لەئینگلتەرەو سیبریادا هەن هەر لە کۆمەڵە گیانداری ئیدیاکارانن . سترۆماتۆلیتەکان خۆیان بەتۆڕێکی یاتەبەقێکی کلسی داپۆشیوە لەکاتی گەشەکردنیاندا . بەکتریاو قەوزە سەوزە شینباوەکان لەناوەڕاستی دێرینی بەرلەکامبریدا (بەرلە 1500 — 2500) ملیون ساڵەوە ، گەشەیان کردووە . ئەو خانە ناوکدارانەی کەلە کۆتایی ئەم وەختەدا دەرکەوتوون مژدەی وەختێکی تازەیان لەگەشەکردنی بایۆلۆجیدا هێناوەو ڕێگەیان بۆ ئافەریدەکردنی (خولقاندنی) ڕووەك و گیانداری بالاتر تەخت کردووە . دەشێت ، لەم وەختەدا ، کەواکەش atmosphere لە 1٪ زیاتری لەئۆکسجین تیادا نەبووبێت و دەشێت کەلەکۆتایی دێرینی بەر لەکامبریدا ڕێژەی ئۆکسجین گەیشتبێتە کەمتر لە 5٪ بەشێوەیەکی گشتی وازانراوە کەوا لەبەر ئەوەی کەگیانداری زۆرو هەمەجۆرە لەچاخی کامبریدا هەبووە دەبێت گیاندارە چەندینە خانەکان واتە میتازواکان Metazoans لەبەرەبەیانی دێرینی بەر لەکامبریدا پەیدا بووبن . بەلام تۆمارگەی بووبەردەکان و کەمی ڕێژەی ئۆکسجین لەکەشی ئەووەختەدا ئەوەمان بۆدەردەخەن کەوا ئەو میتازوا پێشکەو تووانەی کەپێویستیان بەبڕێکی باش لەئۆکسجین هەیە بۆ هەناسەدان ، دەبێت لە کۆتایی دێرینی بەر لەکامبریدا پەیدا بووبن ، واتا نزیکەی (1000) ملیون ساڵ لەمەوبەرەوە .

ب - تۆمارگەی بووبەردەکانی هەرە دێرینی ژیانی ئاشکرا : -

1 — **پرۆتیستا protista (فرطیسیات)** : - **مۆزێکە** لەزیندەوەرە تاك خانەیی یەکان یان بێ خانەیی یەکان باکتریاو کەڕوو هەندێك جار ڤیرۆسەکانیش دەگرێتەوە .

لیستەی ناوی هەندێك لەپرۆتیستا بووبەردەکان : -

لەنێوان هۆزی پرۆتۆزوا کاندا (گیاندارە سەرەتاییەکان = الحیوانات الأبتدائیة) protozoans تەنها گیاندارە گوشتی یەکانن sarcodina کەبایەخێکی بوو بەردیی تایبەتی یان هەبێت چەند ئەندامێك لەم کۆمەڵە پەیکەریان تۆێکلیان هەیە کەلەمادەی تێکتین Tectin یان کالسایت calcite یان ئەرگوانیت Aragonite یان سلیکا (لم) silica پێکهاتووە . گیانداری رادیولاریا Radiolaria کەلقێکە لەگیاندارە گۆشتی یەکان زۆر باش ناسراوە لەڕێگەی قوڕولیتەی پاشماوەکانیانەوە لەنیشتەنی دەریا نوێیەکاندا . هەندێك جۆری ڕادیو لاریا لەناوەڕاستی چاخی ئۆر دۆڤیسی



یەوە دەرکەوتوون و لەچاخی کامبری و چاخی سێ هەمدا گەشەیان کردووە هەتا ئێستاش هەر بەردەوامن فۆرامینیفیراش (مخرمات Foraminifera) کەکۆمەڵە گیانداریکی دەریایی ووردن و سەدەفەکانیان کونکونە ، لقێکی ترە لەگیاندارە گۆشتی یەکان لەچاخی کامبری یەوە هەتا ئێستا هەر بەردەوامن . نزیکەی (30) هەزار جۆریان لێ زانراوە لەمانەش زیاتر لە 90٪ یان بەشێوەی بووبەردن . فۆرامینیفیراکان بەزۆری گیانداری دەریایین چی بەشێوەی بن ئاوکەوتوو (ناخی یەکان) (benThonic) وچی بەشێوەی سەر ئاوکەوتوو (planklonic) ، قەبارەشیان لەنێوان بەشێکی میلمەترو چەند سانتیمەتر سێ جایە کدایە . کۆنترین جۆری فۆرامینیفیراکان لەکەفرەکانی چاخی کامبری و ئۆردۆڤیسیدا هەبوون . گەورەترین جۆریان فوسولیناسیا (Fusulinacea) بووە کەبەشی سەرەوەی چاخی کاربۆنیدا هەبووە ودرێژی یەکەی گەیشتۆتە نزیکەی چەند سانتیمە ترێك ، ئەمانە سەرچاوەیەکی باشن بۆ بووبەردو نزیکەی هەزار ڕەگەزیان لێزانراوە ، فۆرامینیفبراکان لەچاخی دەباشیریدا زۆر هەبوون بەجۆرێکی ئەوتۆ کەهەندێك پێکهاتی بەردی قسل بەناوی ئەوانەوە ناونراون . گیاندارە تیشکدەرەکان و گیاندارە کونکونەکان لەکاتی خۆیدا ڕووبەرێکی زۆریان لەبنکی دەریاکان داگیر کردووە ، دوای مردنیان نیشتەنی تایبەتی یان بەجێ هێشتووە پێی دەوترێت « oaza » هەروەها هەندێك لەبەردە گەچینەکان (الأحجار الجبسیة)

▽ گیانداره سێپلەکان



وەکوو مۆزەخانەیەکی سروشتی ئەوتۆ وایە کەپڕە لەپڕە لەپاشماوەی گیانداره تاك خانەکان . ئەم گیاندارانە سودێکی باشیان لێ وەردەگیرێت لەمەیانی جیۆلۆجیدا بەتایبەتی لەمەیانی بەراوردکردنی چینە جیۆلۆجییەکاندا لەشوێنێکەوە بۆشوێنێکی تر هەروەها لەڕووی قەبلاندنی تەمەنی کەڤرەکان و دابەشکردنی ستونی جیۆلۆجی (العمود الجیولوجی( Geological column) ، واتا برگەیەك (مقطع) بەباری قوولی لەڕووی زەوییەوە بۆناوەوە بەپێکهاتە هەمە جۆرەکانی توێکلی زەویداو زانینی بارەکانی ئاوو هەوای کۆن و ڕادەی سوێری و قولایی ئاوەکان . نموونەش بۆگیانداره تیشکدەرەکان . گیانداری ئەکتینۆما Actinoma وهیلوسفیرا Heliiosphaera ، بەلام نموونەی گیانداره شانۆچکە دارەکان وەکوو گلۆبیجرینا Globigerina وکامیرینا (Camerina) و دێنتالیتایة Dentalina .

2 – ئیسفەنجەکان Sponges

ئیسفەنجە بوو بەردەکان لەبەشی خوارەوەی چاخی کامبرییەوە هەتا ئێستا تۆمار کراون . گوایا هەندێك پاشماوەی تایبەتی ئیسفەنجی کەلە دێرینی بەرلەکامبریدا هەبوون لە گیانداره کونکونەکانەوە (الثقبیات Porifera) گەشەیان کردووە . لەنێوان زیاتر لە (10) هەزار جۆری ئێستا لەئیسفەنج ، تەنها ژمارەیەکی کەمیان هەیە کەبەشی ڕەقی ئەوتۆی تێدابێت کەبەشێوەی بووبەرد بپارێزرێت ئیسفەنجەکانی ئەم سەردەمە بەزۆری ملیان نییەو دەریانشینن بەتایبەتی لەتەنکاوەکاندان ، بەلام لەزەریا قووڵەکانیشدا هەرهەن لەبارەی توێکارییەوە (التشریح Anotomically) بریتین لەکۆمەلەیەکی سەرەتایی لەنێوان گیانداره تاك خانەییە قامچی دارەکان و گیانداره چەندینە خانەکاندا لەشیان ڕیزەکون و بۆریچکەی تیادایە جگە لەوەش درکی پێوەیە . ئەم درکە لەمادەی کالسایت یان سلیکا پێکهاتووەو بریتیە لەو بەشە ڕەقەی لەشی ئیسفەنج کەدەشێت بەشێوەی بووبەرد بپارێزرێت یەکەم بووبەردی ئیسفەنج کەمابێتەوەو تۆمار کرابێت لەبەشی خوارەوەی چاخی کامبرییەوە بووە . لەکۆتایی دێرینی پالیۆزۆیکدا چەند جۆرێکی گرنگیان قڕی تێکەوتووە . بەلام لەچاخی دەباشیریدا گەشەیەکی باشیان کردووە . لەوولاتە جیاوازەکانی جیهاندا باسی ژمارەیەکی زۆر لە جۆرەکانی ئیسفەنج کراوە . زاناکان وای لێك دەدەنەوە کەگوایا بەردە ئەستێی Flint مولگە دەباشیرییەکان Chalk beds مادەی سلیکاکەی لەئیسفەنجەوە بۆ هاتووە لەدێرینی سینۆزۆیکدا گیانداره ئیسفەنجییەکان هەمان ڕۆلی (دەوری) ئێستایان بینیوە لەناو گیانداره دەریاییەکاندا .

3 – گیانداره بۆش ڕیخۆلەیی یەکان

أمعائیة الجوف Coelenterate : ـ ئەمانە گیانداری دەریایی ساکارن و باشترین نموونەی گیانداری شیلانە (مرجان Coral) کەلەدەریاو لەشوێنە تەنکاوە شلەتێنەکاندا دوور لەکاری شەپۆلەکاندا دەژین زۆربەشیان بەشێوەی مۆلگە هەن « مستعمرات colony » و هەندێك جار دورگەی شیلانی (جزرمرجانیة) یان شۆستە لەقەراغ ئاوەکاندا دروست دەکەن . زۆربەی گیانداره شیلانییەکان مادەی گەچین (مادەجبسیة) دەردەدەن بۆ پێکهێنانی پەیکەری ئەستوورو لەو جۆرە گیاندارانەن کەلەپێکهاتنی چەندەها کەڤری نیشتەنیدا (الصخور الرسوبیة) بەشدارن گیانداره شیلانەکان لەچاخی ئۆردۆ ڤیسییەوە دەرکەوتوون و هێشتا هەرماون . بەزۆری لەدەریا تەنکاوە شلەتێنەکاندا دەژین و ناتوانن لەقوراوو قولایی دەریاکاندا بژین . بووبەردی شیلانی لەزۆربەی ناوچەکانی خرۆکی زەویداو لەچەندەها چینی جیۆلوجیدا دۆزراونەتەوە . گرنگترین نموونەش بۆ گیانداره شیلانییەکان کانینیاو Caninia زیفرنیتس Zephrnits وسرنجۆپۆرا (syringopora) بوون .

**4– پێ‌بازوویی‌یەکان (عضدیە الأرجل Brachiopoda)**
ئەمانە کۆمەڵە گیاندارێکی شێوە نەرمۆڵەی (رخویات الشکل – molluscoidea) قەبارە بچووك بوون قاقڵەی هەمەجۆریان هەبووە بۆ پاراستنی خۆیان بەکاریان هێناوە ، قاقڵەکەیان لەدووپارچە پێکهاتووە هێنی پشت و هێنی سك و خۆیان نووسانووە بەبنکی دەریاکانەوە یان بەتەنی گەورەی سەرتاوکەوتووەوە یان بەگیانداری گەورەوە بەهۆی دەزوولەیەکی ماسولکەیی‌یەوە . قاقڵەکەیان ددانەدار بووە ، هەندێکیان قاقڵەکەیان لەمادەی کاربۆناتی کالیسیۆم پێکهاتووە . پێ‌بازوویی‌یەکان لەچاخی کامبریدا دەرکەوتوون و هەتا ئێستاش هەرهەن هەتا ئێستا بووبەردی نزیکەی (30) هەزار جۆر لەپێ بازوویی یەکان دۆزراوەتەوە . گرنگترین نموونەیان : گیانداری سپیرفیرو Spirifer تێریبراتولاو Terebratula ئەتریپاو Atrypa سترۆفۆمینا strophomena بووە .

**5– دوو لەپکەیی‌یەکان واتا دوو سەدەفی‌یەکان** : (ذوات المصراعین Bivalves) ئەمانە پێشیان دەوترێت کەوانە ریشوەدارەکان (ذوات الغلاصم) وەکوو گوێچکەماسی (محار) . ئەمانە گیانداری دەریایین ، هەندێکیان لەئاوی شیریندا دەژین ، لەشیان نەرمە لەناو قاقڵەیەکی دوو پارچەی ددانەداردا دەژین هەندێکیان خۆیان لەقوڕو لیتەی بنکی دەریاکاندا نقوم دەکەن و هەندێکیان مەلەوانن . ئەمانەش لەچاخی ئۆردۆ ڤیسی‌یەوە دەرکەوتوون و هەتا ئێستاش هەرهەن ، بۆ نموونە گیانداری ترایگۆنیاو (Trigonia) گلایسیمیرس و (Glycimers) پێکتین « pecten » .

**6– پێ سکی‌یەکان (بطنقدمیات Gastropoda)** : – وەکوو شەیتانۆکە (هێلکە شەیتانۆکە ، ئەمانە لەقەراغی رووبارو دەریاکاندا دەژین ، لەشەکەیان نەرمە لەناو قاقڵەی ئەستوری هەمەجۆرو هەمەشێوەدا دەژین لەچاخی کامبری‌یەوە دەرکەوتوون و هەتا ئێستا هەرماون لەئاوی سوێرو شیریندا . نموونەش بۆئەمانە گیانداری کۆنەس و (conus) تەریتیلا (Turritella) و فیوسەس (Fusus) و ناتیکا (Natica) یە .
**پێ‌سەرییەکان (رأسیة الأرجل cephalopoda)** : – کۆمەڵە گیاندارێکی نەرمی دەریایین هەندێکیان لەناو قاقڵەیەکی پێچاوپێچدا دەژین کەلەمادەی کالسایت ئەرگوانیت پێکهاتووە . ئەمانە لەکۆتایی چاخی کامبریدا دەرکەوتوون و هەتا ئێستاش هەر بەردەوامن ، نموونەش بۆ ئەمانە گیانداری هەشت پێ (أخطبوط octopus) و کۆمەڵەی تەزبیحی‌یەکان (السبحیات Ammonites) کە بریتین لەگیانداری دەریایی لەچاخی دیڤۆنی‌یەوە دەرکەوتوون . بەلام لەنزیك کۆتایی چاخی دەباشیریدا قڕیان تێکەوتووە ، قاقڵەیەکی پێچاوپێچی گرێ گرێیان هەیە بوو بەردی گرنگ و ناسراوترین نموونەش لەسەر تەزبیحی‌یەکان گیانداری گۆنیاتیت و (Goniatite) هێلدۆسیراس (Hildoceras) و ستیفانۆسیراس و (stephanocerac) میکۆسیراس (Mecoceras) . هەروەها پێ‌سەری‌یەکان جۆری تریشیان هەیە وەکوو کۆمەڵەی فیشەکی‌یەکان واتا گوللەیی‌یەکان « خرطوشیات = قذیفیات Belemnites) کەلە چاخی خەلۆزیدا دەرکەوتوون و لەچاخی دەباشیریدا کۆتایی‌یان هاتووە ، قاقڵەیەکی کلسی‌یان هەیە لەگوللەتۆپ دەچێت و شێوەیەکی قوچەکی ساف [ ناپێچاوپێچ ] هەیە ، هەروەها کۆمەڵەی ناوتیلوید واتا دەریاوانەکان (بحار = نوتی = Nautiloids) کەلەچاخی ئۆردۆڤیسیدا دەرکەوتوون و هەتا ئێستا هەرماون .
**7– پێست درکاویی‌یەکان (شوکیة الجلد = Echinodermata)** : – کۆمەڵە گیاندارێکی دەریایین لەشیان بەتەبەقی کلسی درکاویی داپۆشراوە ، لەشیان نەرمە ، لەچاخی کامبریدا دەرکەوتوون و هەتا ئێستاش هەر بەردەوامن . ئەم



پێ بازوویی یەکان 

گیاندارانە دەکرێن بەهەشت پلەوە : ـ
ئەستێرە تورتەکان واتا ئەستێرە خاوەکانی دەریاو (نجوم البحر الهشة = Brittlestartish ophiuioidea) ئەستێرۆکەکان (نجیمات = Asteroidea) وەکـوو گیـانـداری ئـەستێـرەی دەریـاو Startish زەمەقی‌یەکان (الزنبقیات = crinoidea) وەکوو زەمەقی دەریاو (زنبق البحر = sealily) گۆپکەیی‌یەکان Blastoids شوکیات الجلد البرعمیة) و تورەکەیی‌یەکان (الحیوانات الکیسیة أو المثانیة cystoid) و ئاروویی‌یەکان (الخیاریات Holothuroid) وەکوو خەیاری دەریا « خیار البحر sea cucumber » گیانداره درکاویی‌یەکان « Echnoids » لەچاخی ئۆردۆڤیسیدا دەرکەوتوون و هەتا ئیستاش هەر دەژین ، سەدەفێکی خڕی یان نیمچەخڕی یان قوپاوی درکاویی یان‌هەیە ، پێنج پەلیشیان هەیە نموونەش بۆئەم پلەیە : ـ گیانداری سیداریس cidaris و میکراستەر « micraster » . پلەی زەمەقەکانی دەریا لەگوڵەباخ دەچن رەنگینن و بەشێوەی مۆڵگە لەبنی دەریادا دەژین ، لەچاخی ئۆردۆڤیسیدا دەرکەوتوون و هێشتا هەر بەردەوامن . پلەی بلاستۆید Blastoid : ـ ئەمانەش هەر لەچاخی ئۆردۆڤیسیدا دەرکەوتوون . قاقڵەکەیان لەکوپی چایی دەچێت لەبنکەکەیدا قەدێکی بارێکی کورتی پێوەیە .

**کۆنۆدۆنتا Conodonta** : ـ ئەمانە بووبەردی زۆر ووردو نهێنیدار بوون لەچاخی ئۆردۆڤیسی‌یەوە دەرکەوتوون هەتاوەکوو بەشی سەرەوەی چاخی ترپاسی یان دەشێت هەتا چاخی دەباشیری بەردەوام بوونو کۆمەڵێك لەبووبەردە گرنگەکان پێك دەهێنن ، رۆڵی ئەمانە لەدێرینی پالیۆزۆیکدا وەکوو رۆڵی گیاندارە شانۆچکەدارەکان (فۆرامینیفیرا) بووە لەدێرینی میزۆزۆیك و سینۆزۆیکدا و هەزارەها جۆریان هەبووە .

**گیاندارە چووزەوارەیی‌یەکان Bryozoa** : ـ کۆمەڵە گیاندارێکی سەیرن بەشێوەی مۆڵگە دەژین لەڕووەکی قەوزەیان چووزەوارە « طحلب Moss » دەچن . باشترین نموونەش بۆئەمانە گیانداری حەسیری دەریایە (حصیرة البحر sea mat) پەیکەرە کلسی‌یەکانی ئەم گیاندارە بێ بڕبڕە بچووکانەی (کەلەشێوەی مۆڵگەدا دەژین) لەدێرینی پالیۆزۆیك و پێکهاتە تازەکانیشدا باوو بوون . جۆرەکانی ئێستایان لەدەریادا دەژینو حەز بەئاوی روون دەکەن نەوەك لێل . گیاندارە چووزەوارەیی‌یە دەریایی‌یەکان سەربە پۆلی جیمنۆلایماتان Gymnolae mata . ئەم پۆلەکراوە بەشەش هۆزەوە (دواهۆز ، توورەکە کونکونەکان cystiporata لەلایەن زانا جی‌جی ئەستروڤاوە لەساڵی 1964 داباس کراوە ) . ئەم هۆزانە لەشێوەی مۆڵگەو گیاندارەکانیاندا جیاوازن . سیان لەم هۆزانە دەگەڕێنەوە بۆدێرینی پالیۆزۆیك کەئەمانەن : ـ
دەم مارپێچی‌یەکان Trepostomata و کونکونە توورەکەیی‌یەکان Cystoporata ، سیانەکەی تریشی بریتین لەدەم بازنەیی‌یەکان cyclostomata و دەم شانەیی‌یەکان Ctenostomata ئەمانە لەچاخی ئۆردۆڤیسی‌یەوە دەرکەوتوون . بەلام گیاندارە دەم لێویی‌یەکان Chilostoma لەچاخی دەباشیری‌یەوە دەرکەوتوون . ئەمانە هەموویان هەتا ئێستا هەر دەژین . هەرچەندە کەهەندێك پاشماوە وای دەردەخەن کە گیاندارە چووزەوارەیی‌یەکان لەبەشی سەرووی چاخی کامبری‌یەوە دەرکەوتوون . بەلام یەکەم گیانداری چووزەوارەیی ڕاستەقینە لەبەشی خوارووی چاخی ئۆردۆڤیسی‌یەوە تۆمارکراوەو لەناوەڕاستی چاخی ئۆردۆڤیسی‌یەوە گەشەیەکی باشیان کردووە ئەمانە بریتین لەپێنج هۆزو (20) خێزان ، هەروەها چووزەوارەیی‌یەکان لەسەرووی دێرینی پالیۆزۆیکدا هەبوون . بەلام لەکۆتایی چاخی پێرمیدا چەند خێزانێکیان قڕیان تێکەوتووەو لەدێرینی میزۆزۆیك و سینۆزۆیکدا بەتایبەتی لەچاخی دەباشیری و چاخی سێ‌هەمدا چووزەوارە دەم لێویی‌یەکان زۆر باو بوونو بەشێوەی توێژاڵێکی تەنك بەبەردو سەدەفەوە نووساون رەگەزێکی ئاسایی یشیان هەیە پێی دەوترێت پەردەکوندار Membranipora . گیاندارە چووزەوارەیی‌یەکان . لەمەیانی بووبەردا ، بەرەبەرە گرنگی‌یان پتردەبێت چونکە زۆرن و بەفراوانی لەسەر زەوی بلاو بوونەتەوە .

**پێ جومگەیی یەکان یان جومگەدارەکان**
**مفصلیات Arthropoda** : ـ
ئیمرۆ لەنێوان گیاندارەکانی سەر زەویدا جومگەدارەکان بارێکی تایبەتی (نائاسایی) یان هەیە . چونکە تەنها بەهۆی مێرووەوە (حشرة insect) جومگەدارەکان نزیکەی لە 75 — 80 ٪ئەو هەموو جۆرە گیاندارانە پێکدەهێنن کەباسمان کردن .

جگە لەوەی کەهیچ گیانداریکی چەندینە خانەی ترنییە کەبتوانیت خۆی لەگەل چەند شوینەواریکی جیاوازدا بگونجینیت جومگەدارەکان بەئاسانی بوونەتە بووبەرد چونکە پەیکەریکی دەرەکی رەقیان هەیە . لەبەر ئەوەی کەئەم جۆرە گیاندارانە ناوبەناو کاژ Molt فریٌ دەدەن ، دەشیت کەهەر یەکیکیان چەند جاریك بەشیوەی بووبەرد بپاریزریت (چونکە هەموو جاریك کاژەکە دەبیت بە بووبەردیکی سەربەخۆ) . لەئەنجامی تاقیکردنەوەو لیکولینەوەوە دەرکەوتووە کەدەشیت جومگەدارەکان ببن بەسە چاوەیەکی گرنگی بۆبووبەرد . روالەتی (دیمەنیدەرەوە) جیولۆجی جومگەدارەکان و دەرکەوتنیان لەبەشی خوارەوەی چاخی کامبریەوە هەتا ئیمرۆ روونکی‌یەك دەخاتە سەر رادەی پەیوەندییە ئالۆزەکانی نیوان ئەندامەکانی ئەم هۆزە گیاندارەو میژووی رەگەزەکانیانەوە [ phylogeny ] ئەم هۆزە گەورەو هەمەرەوشتە دەبیت بنچینەیەکی هەمەرەگەزیشی (Heterogenous) (هەمەچیزەی) polyphylitic هەبیت . جومگەدارەکان دەکرین بە شەش کۆمەلەی سەرەکی‌یەوە :

أ ـ چرنووکدارەکان (مخلبيات) onychophora وەکوو گیانداری پیریپاتەس peripatus

ب ـ سیٌپلەکان (ثلاثية الفص Trilobita) کەکۆمەلە گیانداریکی جومگەداری قرتی‌کەوتووە دوو جوٌگە (چالایی) هەبووە لەپشتیاندا لەشیانی کردووە بەسیٌ پلەوە .

جـ ـ جالجالوکەیی‌یەکان (عنكبوتيات chelicerata)

د ـ توێکلدارەکان (قشريات crustacea) .

هـ ـ فرەپییەکان (عديدة الأرجل Miriapoda)

و ـ میرووەکان (الحشرات Insecta) .

وادەردەکەویت کەکۆمەلەی دووهەم و سیٌهەم یەك بنەچەیان هەبیت هەروەها پینجەم و شەشەم .

**گیاندارەسیٌپلەکان (ثلاثية الفص Trilobites)** : ـ لەچاخی کامبریدا نزیکەی 60٪ ی ئەو بووبەردانەی کەباس کراون سیٌپلە بوون . لەبەرەبەیانی چاخی کامبری‌یەوە هەتا کۆتایی چاخی پیرمی (1500) رەگەزو (10) هەزار جۆر لەسیٌپلەکان زانراوە . ئەم ژمارە زۆرە لەسیٌپلەکان لەشیوەو قەبارەدا لەیەکتری جیاوازبوون (دریژی‌یان لەنیو ملیمەترەوە بۆ حەوت سەد ملیمەتر بووە) . سیٌپل پەیکەریکی دەرەکی رەقی هەبووە لە مادەی کالسایت یان فۆسفاتی کالیسیۆم ، رووی لەشیان ساف یان گرنج گرنج یان دڕکاوی بووە . لەبەشی خوارەوەی چاخی کامبریدا (21) هۆز لەسیٌپلەکان هەبووە لەمانەش : ئۆلینیلینا (olenellina)ی سەرەتایی و ریدلیچینا Redlichina . لەبەشی سەرووی چاخی کامبریدا هۆزی ئۆلینیدا olenida تەنها بووبەرد بوون کەلە قوڕە رەشەکانی دەریاکانی ئەورووپادا هەبوون .

**گیاندارە سیٌپلەکان (ثلاثية الفص Trilobites)** : ـ سیٌپلەکان بەکۆنترین گیانداری گەشەکردو دادەنرین کەدەریاکانیان داگیر کردبوو لەچاخی کامبریدا (واتا بەرلە 600 ملیون سال) ، گەلیك زۆرو هەمە جۆرەو چالاك بوون . بەلام لەسەرەتای چاخی ئۆردۆفیسیدا ، بەپەیدابوونی ماسی ، ئەم گیاندارە سیٌ پلانە بەرەو کەمی رویشتن چونکە بوون بەخۆراك بۆماسی هەتاوەکوو لەچاخی پیرمیدا (واتا بەر لە 280 ملیون سال) بەتەواوەتی قریان تی‌کەوت . بۆیە بەم گیاندارانە دەوتریت (سیٌپلەکان) چونکە لەشیان بەسەرو قەدو کلکەوە لە سیٌ بەش پیکهاتووە . هەندیکیان دڕکاویی و هەندیکی تریان بی‌دڕك بوون ، هەندیکیان هەمیشە لەمەلەکردندا بوون کەچی هەندیکی تریان خۆیان لەقوڕی بنی دەریاکاندا نوقوم کردووەو .

**دەم بەشی یەکان (مجزاة الفم Merostomata) و جالجالوکەیی‌یەکان (عنكبوتيات Arachnids)** : ـ

لەو کاتەدا کەگیاندارە شیوە سیٌ پلەیەکان هەرخۆیان تەنها شیوەی دەریایی بوون ، کۆمەلەی گیاندارە پەل قولاپی‌یەکان واتا پەل مقاشی‌یەکان (كلابية الأقدام chelicerata) لەئاوی سویرو دەم بەشی‌یەکان لەئاوی شیریندا دەژیان و خۆیان گونجاندبوو بۆ ژیانی سەرزەوی و مشەخۆریی (وەکوو جالجالوکەیی‌یەکان) . پۆلی دەم بەشی‌یەکان سیٌ کۆمەلە بووە : ئەگلا سپیداو(Aglaspida) زیفۆ سۆراو(xiphosura) واتاکلك شیریی‌یەکان (سيفيات الذيل) کەئەمەش کۆمەلەیەکە لەجومگەدارەکان شاقرژالو هەندیك شیوەی تری قرتی کەوتوو دەگریتەوە ، لەگەل کۆمەلەی ئیورپتیریدا Eurypterida . کۆمەلەی یەکەم لەبەشی خوارەوەی چاخی کامبری‌یەوە بۆناوەراستی چاخی ئوردۆفیسی گوزەرانی کردووە . زیفۆسۆرا کەقرژالی نالە ئەسپی (ابوجنيب ـ نعل

الفرس Horse shoe crab) ئێستا دەگرێتەوە مێژوویەکی جیۆلۆجی درێژی هەیە . نموونە هەرە کۆنەکانیان لە چاخی سیلووریدا ژیاون و لەدواییدا لەچاخی دیڤۆنیدا شێوەی تریان لێ کەوتۆتەوە . لەچاخی ترایاسیدا (واتا 200 ملیۆن ساڵ لەمەوبەر) زۆربەی جۆری قرژاڵە ناڵە ئەسپەکانی ئێستا بەبڵاوی هەبوون ، لەبەرئەوە شایانی ئەوەن کەناوبنرێن بە بووبەردە زیندوەکان living Fossils .گیانداری کۆمەڵەی ئیوریپتیریدا واتادووپشکی دەریایی (sea scorpion) زۆر بەناوبانگ بوون چونکە نموونە بووبەردەکانیان زۆر بەچاکی پارێزراون جگە لەوەی هەندێك جۆریان قەبارە گەورە بوون . بۆ نموونە درێژی گیانداری پتیریگۆتەس pterygotus هەندێك جار گەیشتۆتە (180) سم واتە لەهەموو جومگەدارە ناسراوەکان درێژتر بووە . کۆمەڵەی ئیوریپتیریدا لە چاخی ئۆردۆڤیسیدا دەرکەوتوون و لەچاخی سیلووری و دیڤۆنیدا بەرەو کەم بوونەوە رۆیشتوون هەتالە کۆتایی چاخی پێرمیدا بەتەواوەتی قڕیان تێ کەوتووە . پۆلی چاڵجاڵۆکەییەکان زۆربەی شێوەکانی سەرزەوی دەگرێتەوە ، بەلام دەشێت کەرەچەڵەکی باوك و باپیریان ئاویی بووبێت . دووپشکە هەرە کۆنەکان لەچینی سیلووریدا هەبوون هەندێك لەدووپشکی ئێستا نەدەچوون . دووپشکی ووشکانی راستەقینە لەچاخی کاربۆنییەوە تۆمارکراوە . زاناکان وای لێك دەدەنەوە کەگیاندارە چاڵجاڵۆکەییە ئاوییەکان لەکۆتایی چاخی سیلووریدا بەرەوزەوی دەستی کردووە بەگەشەکردن .

**گیاندارە توێکڵدارەکان (قشريات Crustaceans) : -**

زۆربەی گیاندارە توێکڵدارەکان دەریایین ، هەرچەندە کە کەمێکیشیان لەناوی روبارەکاندا دەژین ، هەندێکیان مشەخۆرن و (طفيلي parasite) هەندێکیان بۆ ژیانی سەرزەوی خۆیان گونجاندووە . پەیکەرە دەرەکییە کلسییەکەیان هەلێکی باشی رێك خستووە بۆ بوونیان بەبەرد (بەبەردبوونیان) ، زۆر لەو کۆمەلانەی کەئێستا دەژین بووبەردی گرنگیان هەیە وەکوو پێکەوانە ریشەدارەکان (خيشوميات الأقدام Branchiopoda) و سەدەفدارەکان ostracoda (الأستراكودا) : وەکوو سیپریس و Cypris فایلوکاریدا Phyllocarida واتا توێکڵ تورتەکان (القشريات الرخوة) ودەپێیەکان (عشر قدميات Deca poda) : وەکوو رۆبیان . پێ کەوانە ریشەدارەکان لەچاخی سیلوورییەوە زانراون . کۆمەڵەی ئوستراکۆدا (وەکوو رۆبیان) ناسراوترین بووبەردی توێکڵدارەکانن ونزیکەی (900) رەگەزیان لێ زانراوە لەچاخی کامبرییەوە هەتا ئێستا . کۆمەڵەی توێکڵ تورتەکان لەچاخی سیلووریدا باو بوون و دەپێیەکان لەدێرینی میزۆزۆیکدا گەشەیان کردووە . بەلام لەکۆتایی چاخی پێرمیدا دەرکەوتوون . قرژاڵیش لەسەرەتای چاخی سێ هەمدا دەرکەوتووە .

**مێرووەکان (الحشرات Insects) : -**

چەند جۆرێك نەبێت ، بەزۆری مێرووەکان زەوی نشینن ، لەبەرئەوە بووبەردیان کەمە . لەگەڵ ئەوەشدا هەتا ئێستا باسی بووبەردی (12) هەزار جۆر لەمێروو تۆمارکراوە نزیکەی حەوت سەد هەزار جۆر لەمێروو هەتا ئێستا دەژین . یەکەم بووبەردی مێروو لەبەردە ئەستیکانی بەشی خواروی چاخی دیڤۆنیدا لەسکوتلەندەدا دەرکەوتووە . بووبەردی کۆنترین و سەرەتایی ترین باڵی مێروو لەبەشی سەرووی چاخی دیڤۆنیدا لەروسیادا دۆزراوەتەوە . بەتینترین گەشەکردنی مێروو لەبەشی سەرووی چاخی کاربۆنیدا بووە ، لەبەشی ژێرەوەی ئەم چاخەدا سیسرك cockroach و کوللە grasshopper وکوللە حاجی (بالبالوکە) فرس النبي Mantid ژیاوە . بەبەرز بوونەوەی لەخشتەی وەختی جیۆلۆجیدا گەشەکردنی تر لەمێرووەکاندا رووی داوەو نزیکەی (15) هۆزی تازە لەمێرووی باڵدار پەیدابووە لەهەموویان دیارتر هۆزی پالیۆپتیرا palaeoptera و پوشکە بەقنگە (يعوب Dragonfly) ومێش ماسی (ذبابة مايو Mayfly) بوون . هەندێك جۆری پالیۆپتیراکان زۆر کەتە بوون بەرادەیەکی ئەوتۆ کەماوەی نێوانی دووباڵەکانیان بەگراوەیی نزیکەی (70) سانتیمەتر بووە . هەروەها سیسرك و قالۆنچە لەچاخی پێرمیدا گەشەیان کردووە . لەچاخی ترایاسییەوە هەتا ئێستا هەموو شێوە بووبەردەکانی مێروو لەو جۆرانەن کەئێستا هەن .

**گرابتولیتینا Graptolithina : -**

ماناکەی لەزمانی لاتینیدا بەردەنووسین (كتابة الحجر stonp writing) دەگرێتەوە کۆمەلە گیاندارێکی بێ بڕبڕەی دەریایین لەدێرینی پالیۆزۆیکدا ژیاون و سەرچاوەیەکی باشن بۆ

بووبەرد . دەست نیشان کردنی ناوچەی وەختی ئۆردۆڤیسیو سیلوری بەزۆری لەبەر رۆشنایی جۆرەکانی ئەمانە دانراوە . لەشیان دەزوولەی (شریت) پێوەیە . جاران لەکۆمەڵەی هایدرۆزوا دادەنران بەلام ئێستا لەکۆمەڵەی گیاندارە پەتکدارەکان (حبلیات chordata) دادەنرێن . هەروەها بەشێوەی بووبەرد لەبەردی قسڵدا دەرهێنراون . ئەمانە بەشێوەی مۆڵکە (colony) ژیاونو لەشیان گەلێك گۆپکەو لقی پێوە بووە . هەندێکیان وەکوو رووەك لەبنی دەریادا جێگیر بوونو هەندێکی تریان خۆیان نووساندووە بەگژوگیای یان شتومەکی سەر ئاوکەوتووەوە بەشێوەیەکی هەڵواسراو لەئاودا ماونەتەوە . ئەم جۆرە گیاندارە کەلەچاخی ئۆردۆڤیسیدا باوبووە ، بووبەردەکەی هەرچەندە دەگمەنە ، لەگەڵ ئەوەشدا لەسەدەفەکانی ئەوچاخەدا لەناوچەی شرۆبشایەر لە ئینگلتەرەو چەند ناوچەیەکی باکوری ناوچەی وێلز دەبینرێت . ئەمانە لەکۆتایی چاخی دیڤۆنیدا فەوتاونو قڕیان تێکەوتووە .

## ماسییەکان (الأسماك fishes)

ماسی لەچاخی دیڤۆنیدا پەیدابووە (واتا بەرلە (420) ملیۆن ساڵەوە هەتا ئێستا) . نموونەش بۆ بووبەردی ماسی : - ماسییەپێست تەبەقییەکان (صفائحية الجلد = أسماك فكية placodermi) و ماسی جیمیوندیا Gemuendia و پتیرۆلێپیس pterolepis وپاراسپیس paraspis و کلیماتەس climatus و ئۆستراکۆدێرەس ostracoderms واتە (الأسماك الصدفية أو الصندوقية) ، ئەمانەش سەرەتاییـنو بێ شەویلگەن لەچاخی دیڤۆنیدا ژیاونو بەرەچەڵەکی گیاندارە بێ برېرەکان رەچاو دەکرێن . وەکوو ماسی سیفالاسپیس Cephalspis و پتیراسپیس pteraspis ، ئەمانە لەجۆگەو ئاوی شیریندا لەچاخی دیڤۆنیدا ژیاون هەروەها پاشماوەی بووبەردەکانیان لەچینی بەردەلەکانی (صخور رملية Sand stones) ناوچەی ئۆلدرێد (oldred) لەئەورووپاو هەروەها لەکەنەداو ئوستەرالیادا بینراون . جگەلەوە نموونە سەرەتایییەکانی ئەمانە لەکەفرە سیلورییەکانی باشووری داکۆتا Dakota وکلورادۆدا دۆزراونەتەوە .

تەڕوو شکییەکان (برمائيات Amphibians) : - پۆلی تەڕووشکییەکان کەئیمڕۆ بۆقو قورناویلکە (سلمندر salamander) ونیت Newt نوێنەریانن رۆڵێکی گرنگیان هەبووە لەچاخی کاربۆنییەوە هەتا ئێستا واتا (بەرلە (350) ملیۆن ساڵەوە ) . تەڕووشکییەکان گەورەترین گیاندار بوون کەلەزەلکاوە خەڵوزییەکاندا زاڵ بوون بەلام تەنها کۆمەڵەیەکی بچووکیان هەتا ئێستا لەژیاندا ماوە . بووبەردی تەڕوو شکییەکان شتێکی سەرنج ڕاکێشەرن چونکە روناکی دەخەنە سەر چۆنێتی پەیدابوونی بنچینەی گیاندارە چوار پێکان لەماسییەوە ، هەروەها لەهەمان کاتدا دەیسەلمێنن کەچۆن گیانداری برېرەداری سەرەتایی تایبەتی توانای ئەوەیان هەبووە کەبۆ ژیانی سەرزەوی خۆیان بگونجێنن . ئیچثیۆستیگا Ichthyostaga کەتەڕو وشکییەکی کۆتایی چاخی دیڤۆنییەو لەناوچەی گرینلاند Greenland بەئاشکرا پەیوەندی نێوانی ماسیو تەڕووشکی تیادا دیارە . زاناکان گیاندارە تەڕووشکییەکان بەئەڵقەیەك دادەنێن لەنێوانی ماسیو گیاندارە چوارپێکاندا . هەروەها هەندێك لەزاناکانی بووبەرد گیانداری تەڕووشکی سیمۆریا Seymouria بە ئەڵقەیەکی وون بوو « حلقة مفقودة » دادەنێن لە نێوانی گیاندارە تەڕو وشکییەکانو خشوکەکاندا « زواحف » .

پەراوێزەکان .

---

1 — من بەبیرو ڕای خۆم وای بەباش دەزانم کەزاراوەی (بووبەرد) لەجیاتی (بەژەوەبوو) یان (بەبەردبوو) بەرامبەر زاراوەی (متحجر = احفور) عەرەبی بەکار بهێنرێت ، چونکە (بووبەرد) زاراوەیەکی کورتەو ئاسانە لەسەرزمانو ووشەی تری لێ وەر دەگیرێت .

2 — مەبەست لەشەیتانۆکە هێلکە شەیتانۆکەیە واتا (حلزون snial)

3 — پێ بازوویی یەکان : کۆمەلە گیانداریکی بێبرېرەی دەریایین سەدەفیان هەیە لەگوێچکە ماسی دەچن بۆنموونە : سەدەفە چرایی یەکان (صدفة مصباحية lampshell)

4 — حەسیری دەریا = گیانداریکی سەیرە لەرووەکی چووزەوارە واتا (طحلب) دەچێت بەشێوەی مۆلگە دەژی .

5 — خشتـەی وەختی جیولۆجی (جـدول الازمنة الجیـولوجیة (Geological Time scale) ئـەو خشتەیـەیە کـەمـاوە (وەختـە) جیولۆجی‌یەکانی تیادا کزاوە بەچەند بەشێکەوە لەزۆرە بـۆکەم : هـەرە دێرین ، چـاخ ، سەردەم ، سـەدە .... ئەستووریی‌یە لەگەل خێـرایی نیشتندا دەتـوانرێت ئـەو وەختـە بـزانـرێت کـەچینێکی (100) مـەتـر ئـەسـتـور دەیخاینێت ) .

7 — لێـرەدا مەبـەستمان لە (کـارەبا) ئـەو مادە رەقـە زەردە شووشەیی‌یە کەتەزبێچو بازنی لێ دروست دەکرێت .

8 — وەختـە جیـولوجـی‌یـەکـان دەکـرێن بـەدوو بـەشی سەرەکی‌یەوە . یەکەمیان هەرە دێرینی‌ژیانی نادیار (ابـد الحیاة السحیقیة) أبو ابد الحیاة الخفیة .

کەژیانی تیادا نەبووەو دووەمیان هەرە دێرینی ژیانی دیار (ابدأ الحیاة الظاهرة) کەسەرەتای ژیانی لێوە دەرکەوتووە

9 — مـەبـەست لەچـاخ (حقبـة period) بـەشێکـە لەوەختی جیولوجی .

سەرچاوەکان

1 — الجیـولوجیا للجمیـع / تالیف عـادل حاتم جـوزی / من منشورات وزارة الثقافة والاعلام / سلسلة الکتب العلمیة 6 / دار الرشید للنشر / 1980 .

2 — باطن الارض / تألیف آلان دیفیـز / ترجمـة د . یوسف شوقی الطبعة العربیة تصدرها الهیئة المصریة العامة للکتاب بالاشتراك مع مؤسسة ماکدونالد للنشر / انجلترا .

3 — مبادئ علم الارض (الجیولوجیا) تالیف / الدکاترة جلال الدین حافظ ویحی محمد انور ومحمد العربي فوزي / جامعة الاسکندریة دار المعارف بمصر .

4 — Geology

A. J. smith

Hamlyn all — collour paper backs

5 The new Encyclopedia britanica volume 7 1974

ئەنسکلۆپیدیای بەریتانی / بەرگی حەوتەم / ساڵی 1947

تۆماری بووبەردەکان دەکرێت بەم بەشانەوە : ـ

أ ـ تۆماری بووبەردەکانی بەر لەکامبیری واتا Precambrian Fossi record

ب ـ تۆماری بووبەردەکانی هەرەدێرینی ژیانی ئاشکرا (الحیاة الظاهـرة) phanerozoic Eon fossi record کـەئـەمـانـە دەگرێتەوە : ـ

1 — زینـدەوەرە تاك خـانەکـان (Protista) وەکوو گیـاندارە تـاك خانەکان (protozoans) بۆنمونە گیانداری فۆرامنیفیرا (Foramini fera) .

2 — ئیسفەنجەکان (sponges) وەکوو گیانداری ئیسفەنج .

3 — بۆش ریخۆلەیی‌یەکان (coelenterata) وەکوو گیانداری شیلان (مرجان coral) .

4 — نەرمۆلەکان (النواعم mollusca) وەکو گیانداری گوێچکە ماسی (المحار = oyster) .

5 — کۆنودونتا Conodonta کەئەمانەش کۆمەڵە گیاندارێکن .

6 — گیاندارە چووزە وارەیی یەکان (الحیوانـات الطحلبیة = Bryozoa) . وەکوو گیانداری حەسیری دەریا (حصیرة البحر sea mat) .

7 — بێ بازوویی یەکـان (عضدیـة الأرجل Brahiopoda) وەکـوو سەدەفە چـرایی‌یەکـان (الأصداف المصبـاحیة = lamp shells) .

8 — بێ جومگەیی‌یەکان ( مفصلیات الأرجل Arthro Poda) وەکوو مێرووەکان (الحشرات Insects) لەگەڵ گیاندارە سێ‌پلەکان (ثلاثیة الفص Trilobites) .

9 — پێست درکاویی‌یەکان ( شوکیة الجلد Echinodermata وەکوو ژیشکی دەریا (قنفذ البحر Sea urchin) .

10 — دەزوولەیی‌یەکان (بەردە نووسەکان Graptolithina) .

11 — ماسی‌یەکان (الأسماك The Fishes) .

12 — تەرووشکی‌یەکان (ووشکاوەکی‌یەکان) واتا (البرمـائیات = Amphibia) وەکـوو بـۆق و قـورنـاویلکـە (سلمنـدر Salamander) .

13 — خشۆکەکان (الزواحف Reptilia) وەکوو کیسەڵ .

14 — باڵندەکان (الطیور The birds)

15 — شیردەرەکان (اللبائن = الثدییات Mammals)

16 — رووەك (النباتات plants)

حجی جعفر
دهوك

# چەند وێنێت کوردەواری

« داستانا خەج و سیابەندادا یا ( سیابەندوڤ سەمەند ) پێتڤی یە ئەم بزانین کو ئەدەبی کوردی دبیتە دوو بەش ، بەشەك ئەدەبێ نڤیسیەو بەشەك ئەدەبێ نەنڤیسیە .
ئەدەبی نڤیسی : ئەو بەرهەمەیە یێ کو خودانی وی دیارە .
بەلام ئەدەبێ نەنڤیسی ئەو بەرهەمەیەیێ کوخودانی وی دیارنە وەکی : ـ
داستان و چیرۆکێت فلکلۆری .
داستانا خەج و سیابەندا ژ ئەدەبێ کوردی یێ نە نڤیسی دهاتە ژمارتن ، چونکی ملکێ هەمی میللەتی بوویە و داهێتنانا هەمی خەلکی بوویە . ئەڤ ئەدەبێ نە نڤیسی کەم یان زۆر یێ دێتە نڤیسین ژلای ڕۆشنبیریت کوردڤە چونکی مەترسیەکا مەزن هەیە بو ووندا کرنا ڤی رەنگی ئەدەبی .
( د . نور الدین زازا ) دبێژیت : ـ
( ئەگەر ژ ئیرو ب شوندا ئەم گوهـ نە دەین فلکلورا خو یێ وندایەو هەرە ) .
برایێت هێژا ئەڤ گوتنا سەیدایێ مەزن نورالدین زازا گەلێك راستو دروستە هەر وەسا جهێ پیتە یێ دانی یە نە خاسمە جەم شارەزاو پسپورێت زمانێ کوردی بۆ کۆم ڤەکرنو ڤەچەماندنا سترانو چیرۆكو داستانو ئەفسانەو پەندو مەتەلۆکێت کوردی ، هەتا وەکو ڕۆژەك بێتو لچاپ بدەن .
هەکە ئەم شیاین کارەکێ هۆسا بەرکەفت بکەین دێ خزمەتەکا مەزن دیاری میللەتێ خو و زمانێ خو کەین .
ئەڤ بزاڤا نهودڤان سالادا دێتە کرن بۆکۆم ڤەکرنو خرڤە کرنا فلکلورێ کوردیو لچاپ دانێ ، جهێ شانازیا هەمێ ڕۆشنبیرەکی یە ب تایبەتێ لئەرمنستانا سۆڤیت لڤیرە پێتڤی یە گوتنەکا د . عزالدین رسول بیژین ل بابەت ڤێ گوتنا سەرێ دکتور کەرەم دکەت دبێژیت . ( ئەو بزاڤا ئەدەبی هاتیە کرنو دێنە کرن دناڤ (89) هەزار کەساندا ل ئەرمنستانا سۆڤیت هەندی بزاڤا هەمی کوردێت جیهانی یە ب دریژیا میژوویا میللەتێ کورد ) . بەلێ سەد مخابن ئەڤ بەرهەمە ب مەتلا زیژی ناگە هیتە بەردەستێت روشنبیرێت کورد .

ئەڤ داستانا ل بەر دەستێت مەولبن گوتنامە یا ئەڤرۆکە داستانەکە ژهزار داستانیت میللەتێ کورد رەش مالەکا ژهزار رەش مالیت چیایێ سیپانێ و ئەلەگەزێ . گوتنە کە ژمە لیونها گوتنیت عەرەبێ شەموو حاجیێ جندێ ئوردیخانی جلیلو ئەمین ئەڤدالو قەناتی کوردو جاسمی جلیل ... هتد .
گەلی هەڤالان : ـ
ئەگەر بینو هێدی هێدی ، هیرك هیرك لاپەرێت داستانا خەج و سیابەندا یاکو هێژا سیابە ندوڤ سەمەند نڤیسیێ ، ڤەدەین و جوان بخوینین دێ بۆمە دیاربت نەك هەر خەندقاندنا دوو دلایە ددەریا ئەڤینێدا . نەك هەر چرمساندنا دوو گولایە لسەرێ چیایێ سیپانێدا یان چیروکەکە هاتیە ڤەهاندن بۆ کورت کرنا شەڤیت زستانا . نەء ..... هەر ئەڤە نینە ..
ئەز دبێم ئاوێنەیەکە ، قودیکەکە هەمێ عەدەتو تەقالیدو رەوشتێت میللەتێ کورد ، نەخاسمە دوی چاخیدا بومە ديارو خویا دکەت .... ژمیرخواسیو سوارچاکی ، سروشتو طبیعەتی ، سۆزو ئەڤینێ ، عەهدو بەیمانا هاتن و چوونێ ، مێڤان و مێڤانداریێ ، رابوونورونیشتنێ ، خارنوڤەخارنی .... هتد .
گەر هان ولاپەرێ نیکێ ژڤێ داستانێ تیك ڤەدەین وێ بینین : ـ
1) وینەیەکێ ریكو پیك ، جوانو قەشەنگ ، راستو دروست ، خۆرۆ خۆرسن بۆمە هاتیە کیشان ژ ریبارو نهالو چیاو جومو جەلەلایت کوردستانێ ، وەکی دڤان مالکێت ژێریدا : ـ
بهار بو بهار ، گول . سۆسنا بیندابو .
ژبارانێ ، کەسك سورێ شاخ ڤەدابو .
ئاڤێد بە رڤێد بە لەکیپا پێلدوا
ژڤونتارێد چیا دکشییا .
بێلند سپی دکەتنە ناڤ گەلییا .
دلەزیان ، خۆ دکهیناندنە چایرا .
.......... ل 12 — 13 خەج و سیابەند
باوەر بکەن ، هەر ئەڤ جوانیە بوویە ، هەر ئەڤ بەفرو نهالو

چیاو گەلی‌یە بووینە . گۆران و مەولەوی و خانی دین هار کرینە .
2) وینێ دووێ : ــ کۆچەرایەتێ : ــ
هەکە ئەم بەردەوام بین سەر خاندنا ڤێ داستانێ دێ بینین کوچەرایەتێ رەوشتەکە ژ رەوشتیت کەڤن ، میللەتێ کورد کەچەرایەتێ کری‌یەو شانازی پێ بریە . چونکی سەربەستیا خوتیدا دیتی‌یە .
هاڤینا وەختێ دنیال دەشتێ (گەرمیانە) گەرم دبوو دا کوچەر بەرێ خۆ دەنە زوزانا ، بەرکانی وکەفیت بەفرێ ، ئەڤ وێنەیە ب جوانی دلاپەرێ (15) دا خۆیا دبیت : ــ

**ئەو کۆچێد درێژ سەکنین ڤیزارێ**
**بارخانێ گران دانینە عەردێ**
**بۆ ڤەگرتنا کۆن دگرێیان جهێ خاس**
**ئەو زو تۆب دکا دور بەرا قرشا .**
**کۆجك دانینەبن بارێ عەرشا**
**هەڤیر دەسترێ‌و لۆشێ سێلێ**
**زو بەلادکە بۆی شیڤا ئێلێ**

هن ڤر .... هن دەژمان ، ب‌یەك بانگی ، لتەڤ ستەیرکا بێ حەساب‌و حەزار رەنگی ،
**ئاگرێ کوچکا ناڤ چولا شوولی .**
**بینا نانێ لۆش ، گوشتێ قەلاندی**
ـــــــــ ل 16 سیابەندو خەجێ
بەلێ دنیا دێ ساربیت ، جارەکادی ــ بەفرو باران دێ کارێ خوکەن بێنە زۆزانا ، ئەڤجا کوچەر دێ کارێ خۆکەنە بێنە دەشتێ ــ کچ بی‌بی . دەست دەست ــ قول قول .
دێن‌و سترانێت ئەڤین بێژن .
دەردێ دلی خو دەردبرن ب‌ستران‌و لاڤژا ... ئەڤ وینەیە ب‌ڤێ رەنگێ خارێ بۆمە تومار کری‌یە :
**برا ئەو پیشێ خێرێ وایێ ڤەت نەبینە .**
**کێ عەدەد هەنارد سەرمێ سەرمەوات تینە**
**وەکی دەرگسێ نە بدلێ ڤیزێ‌بە ، ڤیز نەستینە**
**لێ وەکی بستینە ، ئەو سەر سەرێ وێ نو لێ روهیستینە هسیتینە**
**نەب دلێ خۆە ئەو دچە دبە بەرمالێ**
**چیاو زۆزانۆ وەرن سەر وی حالی**

ـــــــــ ل 17 **سیابەند وخەجێ**
وەسا دیارە دڤان مالکێت سەریدا کوکچا کورد دوی وەختیدا بگرە هەتا نهوژێ یارێ خوب‌دلێ خۆنەهەل بژارتی‌یە لە ورا کچا کورد نە رازیبنیا خۆە ب‌ستران دەربری‌یە .

3) وینێ سێیێ : ــ سوار چاکی‌و مێرخاس : ــ بێ گومانە سوارچاکی مێرخاسی رەوشتەکە ژ رەوشتێت کوردان گەلێك خەلك کوردان ناس دکەن ب‌ڤی ناڤی هەتا وەکو رۆژهەلاتناسێ بناڤد دەنگ مینورسکی گوتیە وان (میرخواسێت رۆژهەلاتی) . دیسا ، لاوك‌و حەیرانیت کوردێ دبرن ب‌ڤی رەنگی فلکلوری وەکی : ــ چەتو ، ئەحمەد ئاغایێ میلی ، دەرویشێ عەبدی ، صالحێ ناسو ، عەمێ کوزێ ، گەنج خلیل ..... هتد .
دڤێ داستانێدا ب‌رەنگەکێ جوان ئەڤ وینە یەیێ هاتیە کیشان دلاپەرێ (57 ــ 58) دا سەر زارێ سیابەندێ : ــ
**ئەز هەمە سیابەندم . سیابەندێ دینم**
**تەنگەو بەرێ هەسپێ دشدینم**
**ئەزێ حەزار مێرێ مەرافا بکوژم**
**سەرێ مەرا ڤباشی ئاغیرا پیشکیش بینم**
یان : ــ

ڤرا پیشرا هات شەرەکی گران
پریسکی رمێ دبەکیا عەزمان

تە دگوت هەڤەو کەتن دوو چیا
بن واناوا عەرد ، دهەژیا
هیرینا هەسپا دکەتە راستا
قوژینا مێرا دکەتە بەستا

4) وینێ چارێ دیوانخانا کوردی‌و مێڤانداری : ــ
مێڤانداری‌و قەدرگرتنا مێڤانی د ناڤ کورداندا تشتەك پیرۆزە هەر رۆژهەلاتیك هاتبیتە دناڤ کورداندا هەست ب ڤی عەدەتی باش کری‌یەو بەحسێ دیوانخانا کوردی دناڤ ئاخفتنێت خودا کری‌یە .
فاسیل نیکیێ : ــ کورد ناسێ هێژا دبێژیت : ــ

ـيوانخانا كوردى حـالەتێ مرۆڤێ كـورد خۆيـا دكەت ، هـەر
ژگەڤن‌دا ، كورد خۆدان ديوان بوونە ، بەلێوە ، نەبيت ديوانا
ـئغايێ وەك ديوانخانا هەژارەكى بيت .
ـداستانا خەج و سيابەندێ‌دا هـەردوو وێنە دێنـە گرتن يـەك
ژـيوانخانـا ئەحمـد ئاغـاى ، كو بـڤى رەنگى فـارێ وەصف
ـكەت : ـ

**مالا ئەحمە ئاغادا مێڤان رونشتبوون**
**ئەڤ ژێ گرەگرێ ئيلێيە ، دەولەتى بوون**
هەتا دبێژيت : ـ
سيابەند سەلامدا و تەمەنە بۆ بەر ئاغێ ،
ئاغا ئۆتاخێدا رونشتبو سەر خالێ ـ خاليچا ،
تژى بە گلى بوون بەر يالا ويدا .

ريدان دريێ پيچا سپێ ل سەرى .
دورێ روينشتبون سێ چار تيلباسێ

تژبى دكشاندن ، كەتبوون شێورى
دەست داندا بو بە ختێ وى دەورێ .

چەعڤى قەلب سيابەندى دنێرى
فەنى پرسى كرژوى .

دڤان مالكێت سەرى‌دا بۆمە ديار دبيت كومالا ئاغاى مرۆڤێت
گرگرە لێ بوون هەر وەسا تژى ناليك و دوشك و باليف بوويە ....
بەلێ وەنەبيت ژمرۆڤێت پيس ياخالى بيت . ئەڤە ژى صفەتەكە
ژديوانخانا كورى !! سەيدايێ خانى بۆمە دگێريت كو ديوانخانا
ميرێ بۆتان ژى ژمرۆڤێت پيس و ناپاك بێ بار نەبوويە ، مروڤەك
تێدابوويە بـناڤێ (بەكۆ) دبيژيت : ـ

**ناڤێ وى منافقى (بكر) بوو**
**بەلكى ژ (بلوقيا) بـتەر بوو**
هەتا دبيژيت : ـ
تاجدين دگونە مير عيانى
ميرم بكە دەرڤى دەرگەڤانى

ــــــــ ل 89 بەم وزين هەولير .
وێنێ دووێ ژديـوانا پيـرە ژنـەكێ بـوكێشـايـە بـڤى رەنگێ
خارێ : ـ
**خودێ تەرابە، كۆرێ منێ رێوى**
**مێڤان ، مێڤانى خوديبە دەلال**

**تەواقادكم ، كەرمكە ، تو مێڤانى**
**زو ئەمرى سەر بوكا خوەكر**

---

**هەسپێ شێ بكشينە هۆندور**
**تەنگەو بەرێ وێ بستكە ، دەبرێ بكە بەر**
**لێ ئەوێ سيابەند بەر ئاليبێ دايونى**
**سەر خاليچادا ڕونشتاندنى**
**تەختە راست كرن بەعەشيرى**
**چ مالدا هەبوو سەر تەختى دانى**

**قولخ كرن ژميڤانێ نەناسرا**
**كيفاوى خوەش كرن مەتەلوكا**
ــــــ **ل 127 ـــ 126 سيابەندو خەجێ**

راستە ژنا كورد پيشە وازيا ميڤانان دكەت هەتا مال خۆى مالێ
ژى لمال نەبيت وەكو ڕۆژهەلاتا من (سوان) كەرەم كرى .
5) وێنێ پينجێ : ـ ئەڤين : ـ
ئەڤين و سروشت و گوارنى پـارچەيـەكە ژهـەست و نەستێت
مرۆڤێ كورد .
ئەگەر ئەم سەرە نجەكێ بدەينە داستان و چيـروك و هوزانيت
كوردى دێ بۆمە خۆيا بيت كو ستران بيژێ كورد يان چيروك
بيژێ كورد يان هوزانڤانێ كورد ، هەردەم جوانيا ژنێ گرێ دايە
بـجوانيا سروشتى‌ڤە ، دكو بكاريت جوانيا ژنا كورد دەبيريت و
دياربكەت .
بۆ نمونە : ـ
دەم و لێڤ ب بشكوژا گولێ تشبيە كريە ...

سينگ و مەمكێت خرو ليك دايێ ، بـخەملا بهارێ ، يانب باغجێ
گولا يان سيڤا يان بـزۆزانا تشبيە كريە كەزێ و بسكێت دريژ
بـشريتێت رەش‌مالان يان بـرەشەماران تشبيە كـريە . يـان

چاڤێت رەش و بەلەك ب چاڤێت مامزا ، گەروەنـا سپی و زەلال ب بەرێ مەرمەری یان پەنیری زوّزانا یان بەفرا سەرێ چیا . بەژنا بلندو هەلکیشایی ب دارا سپینداری یان سەرووێ یـان هەڤرستێ تشبیه کریە ..... ئەڤ وێنیت مە گوتین بوّمە ب جوان و ژین هاتی ێت هاتینە کیشان دناڤ داستانا خەج و سیابەندی دا بوّ نمونە : ـ

**بەژنا وێ نوّلا چیایێ کەس**
**بروّ برژانکی وێ نوّلا قەیتانی رەش**
**دەڤێ وێ بچوك ، گەردەن قەرقاش .**
**لیڤیت وێ زراڤ ، نوّلا بەلگێ کاخەزێ .**
**جەعڤێ وێ رەش ، نوّلا ئاڤ ناڤ تاسێ .**
**چل گولیسێ رەش لە سەرنا ملاوێ .**

یان وەختی سیابەند پرسیارێ ژخەجێ دەکرت .
دبیژیتێ : ـ
**ناڤێ تە چیە ، کوکە چینا من ؟**
**توجەوا دارا چنارێ سەکنی سەر رییا من !**

هوّسا ئەڤین و سترانێت ئەڤینێ لاپەرێکێ مەزن و بـەرفرەهـ دناڤ ئەدەل و فلکلوّرێ کوردیدا گرتیە ، ئەڤە ژی نیشانەکە کو مروّڤ کورد ئەڤیندار بوویە و ئەڤین کریە ، لەورا سـەیدایی مەزن سەرداریێ هوزانڤانێت کورد خانیێ هیژا دبیژیت :

| | |
|---|---|
| خانی ژکمالی بی کمالی | مەیدانی کمالی دیت خالی |
| یەعنی نەژقابلی و خبیری | بەلکی بە تعصبی عشیری |
| اینایە نظام و انتظامی | کیشایە جەڤا ژبووی عامی |
| داخلق نە بیژیتن کو اکراد | بێ مەعرفتن بێ اصل و بنیاد |
| انواعی ملل خودان کتیبن | کرمانج تنێ دبێ حسیبن |
| هەم اهلی نظر نەبین کو کرمانج | عشقێ نە کرن ژبو خوە ئامانج |
| بێ بەهر . نە ئەڤ ژعشقبازی | فارغ ژحقیقی و مجازی |

مەم و زین هەولیر ل 68

6) وێنێ شەشێ : ـ راڤ و نیچیر : ـ
ب طبیعەتی خو مێرێ کورد نیچیرڤانە ، چاڤیت خو ڤەدکەت و بەری خو دەتە چیا ..
چونکی کەلی و نهال ، چول و چەلەخنە ، کانی و ئاڤیت کوردستانێ دپرن ژهرچ و گورگان ، بەرازو پلنکان ، بـزن و نیریـان ، کەو ویوران ... هتد .
ئەڤی جیهانەکا هوّسا تایبەتی ، چەدا ! نیچیر ڤـانیت زیرەك و پالەوان مینا سیابەندێ سلیڤا ژێ نارابن ؟! ئەڤ وینێ راڤـ و نیچیرا بومـە دێنە کێشـان و ناڤ لاپـەریت 99 — 161 — 162 دا وەختێ دبیژیت : ـ

**زور زو تەعشقێ خوارن ،**
**لێ هەسپا سیار بوون**
**ئاژوتن بەر چیایی نیچیری**
**ئیڤارێ ژنیچیر ڤەکەریان کەسری**
**روّژ ترا دنێ چونە میّشە**
**نیچیرا کاکوڤییاو بزنێیت کوڤی .**

یان وەختی خەجێ دخازیت ژسیابەندی کـو نەکـەڤینە ل دیڤ نیرێ کوڤی : ـ

**سیابەند خەبەرێ وێ نەکر .**
**تیرو کەڤانێ خو هلدا ،**

**پەی کاکوڤی کەت ،**
**کاکوڤی جاهل ئەو دیت ،**

**دەها کوجلی لەز کەت ،**
**سەرکەڤرارا بازدا ،**
**ژکەلی و ژنارارا بازدا**

کەتە ناڤ میّشێ ، دەرکەوت ، جهێ راست و دوز دیسان بەری خوە دا چیا ، کەلیا ، بانیا ، هەتا ... کاکوڤی وەستاندو زەرێ ئاسێکر .
ب راستی ئەڤە جوانترین وینەیە راسترین تابلوێ نیچیرو نیچیر ڤانانە بومە هاتیە گرتن .
7) وێنێ حەڤتێ : کانی یا گوندی : ـ

هەریفینکەکی رێ یاوی کەفتیە کوردستانێ ، نزیك یان دیر چەند ریزەك سەرکانی یا گوندی دناف ئاخفتنیت خوّدا کریە .
حسين علي شانوڤ دبێژیت
( دەمێ ئیڤاران کچیك کارێ خوە بدیماهی دینن ، دێ خو خەملینن و قول ـ قول ، ژێر چافێت عەشق بازارا دچنە سەرکانی ، گوندی ، جارانا هەیە چەردگوزیت وان تژی ئافن بەلی بسەد هەجەتا دی ئافا خو دیژن و بەرێ خو دەنە سەر ئافی ! ... هتد ) ئەڤ دیمەنێ هەیێ سەری بوّمە دەروکەڤیت دلاپەرێ (93 — 94) دا وەختی خەجی حەز دکەت دەلالی دلێ خو سیابەندێ سلیڤێ ببینت ، بەلێ ژبەر برایێت خوّ شەرم دکە راست و راست بچیتە لنك وی ، ڤیجا بهانا ئافێ ڤێ کەسەرێ ژدلێ خوە دەرتیخینیت ، دبێژیت : ـ

**خەجێ جێرێ ئافێ هلدا**
**زو زو ژکوّن دەرکەت**

**هەتا دبێژیت : ـ**
**ئاڤ بر ، وەکی میڤانێ عەزیز**
**ورا دەستێ خوە بشوّن**
**بئاڤا کانیێ لنکێ خوبشوّن**
**وەکی جنەکێ ورا حیسابن .**

وەنەبیت ئەڤ دیمەنە ژبیرا هوزانڤانێ چەرخێ بیستێ چودبیت ، ئەڤ دیمەنی کانیێ د قول قولێت کچان چەر سەر ملان ، ژێر چاڤێن خورن لاوان دگەل هەتاف زەرکا ئیڤاران ، تیك هەل دین دناف دێرە شیعرەکا هوزانڤانی عەشق و جوانیێ سروشت و ئازادی ، ماموستا گوران وەختی دبێژیت :
**ئیوارەیە وا هەڵگرە سا گوزەیی تازە**
**رێ ی کانی (قوبان) مونتەظیری جیلوەیی نازە !**

8) وێنێ هەشتێ : ـ سترانیت زاروکا : ـ
رەحمە د : کامەران بدرخان دبێژین : ـ
( ژنا کورد بچیکێ خوە مەزن دکەت ، پەروەردە دکەت فێرێ سەربەستێ و نیشتمان پەرەریێ و سوار چاکیێ دکەت . )

راستە دایکا کورد هەر ژکەڤنیدا ، شارەزا بویە دپەروەردە کرنا بچیکادا ، جهێ یەکی خوش بو دیتیە ئەڤە ژی یان لاندەك ، یان دێ دیك ، یان جولانگ ، بوّیە . ژناکورد دبەر کورێ خوّرا بدەنگەکێ زەلال و ب ئاوازێکێ دلسوّژ ستران و لاڤژە بو کوتینە ، وکو چاڤێت بچیکی وێ بچنە سەریەك و بکەڤینە خەوەکا شیرین و پر خەونیت خوّش ، هەروەسا ئەم دشێن بێژین کو ژنا کورد بڤان سترانا دلسوزیا خو بو زارێ خوە دیار و خوّیا دکەت ، خەمە و کوڤانیت خوە پێ ی سڤك دکەت .

ئەڤ رەنگێ سترانا ، پەروەدە کارین بچیکان دبێژن : ـ کارەکێ ئیجگار مەزن دکەڤینیتە بچیکی ، بەلێ سەد مخابن روّژ بو روّژێ ئەڤ سترانەیێ کێم دین و دایکا کورد یاپشت کوهیێ خوّڤە دهاڤێت ، لەو کوّم کرن و خڕ ڤەکرنا ڤان سترانا بکارێکێ مەزن دێتە ژماردن .
خانێی مەزن سەرداری هوزانڤانێت کورد زوی ـ زوی هەست پەروەرد کرنا زاروەکریە ، لەو (نوّبارا) خوّ بوّ وان دیاری کریە . کەرەم دکەت دبێژیت : ـ

**ژپاش حمدو صەلەواتان**
**ئەڤ چەند کەلیمە نەژلوغاتان**
**ڤیك ئێخستن ئەحمەدێ خانی**
**ناڤ نوّبارا بچووکان لێ دانی**
**نە ژبوّ صاحب رەواجان**
**بەلکە ژبو بچوکێت کرمانجان**

نوّبارا ئەحمەدێ خانی

دداستانا سیابەندو خەجێدا ئەڤ دەنگێ سترانا دەنگ ڤەدەت ، وەختێ پیرێ پێت خوّە دبەر لاندکا سیابەندیرا دینیت و د بەت : ـ

**کە سەر دلی من چوو خاردا**
**سازبەند سازێ خوە ئانس ژوّردا ،**

**نزانم ئیسال چ گوت ، چ خەبەردا ،**
**کوّرپێکێ منێ نزانە ، بێخمە ،**

دایك دلورینه ، دلدا خه‌مه ،
لوری لاوو ، لاوێ من کوڕینه
ئێلا مه‌وێ بسترینه
ئه‌زێ ناڤ لاوێ خوه داینم
سیابه‌ندێ سلیڤیه ،

یان دبێژیت :

لوری لاوو
لوری لاوو

چ ده‌زسمالا ـ گولی ـ گولی
تژی سیڤو تری

9) وێنێ نه‌هێ : په‌یمانو سوز ئه‌گه‌ر هاتو ئه‌م سه‌ره‌نجه‌کا سڤك‌و سه‌رپێ بده‌ینه چیرۆك‌و داستانێت کوردی یان گوهـ بده‌ینه ده‌نگو بیژو چیرۆك بیژیت کورد ، دێ بومه دیار بیت ، کو ، کورو کچێت کورد ژدل یه‌کتر حه‌باندینه ، ئه‌ڤیناد‌انا ئه‌ڤینه‌کا پاك‌و راست بوویه بگره گه‌لێك جاران جانێ خوه قوربانی ئه‌ڤینا خوه کرینه ، وه‌کی زینا خویشکا میرێ بوتان ، سه‌یرانو بهار پشتی مه‌مێ ئالان ، لخو حه‌رام کرن .
شیرینا خو دانا بر چا به‌له‌ك پشتی فه‌رهادی به‌ری خو نه‌دا چیایێ بێستونێ .
ئه‌ڤی چه‌داخه جو سوزو په‌یمانێت داینه سیابه‌ندی بجهی ناهینیت ؟! چه‌واپشتی سیابه‌ندی سینگ‌و مه‌میکان دکه‌ته باغجێ ئیره‌م ؟!
خه‌جێ دبێت :

ئاگرێکی که‌تیه کوچکا ماخینا ،
تێدا دشه‌وته باخچه نکێ گولا ،
منێ سوندەکێ خواری‌یه سونداته‌مام
خنیژی لاوکێ ده‌لال ، ده‌ستێ که‌س ،
نه‌چه ناڤ ڤان مه‌مکێ گولدای .

خه‌جێ وه‌کو ئه‌ڤیندارەکا کورد ، ئه‌و سوزو په‌یمانیت داینه سیابه‌ندی ژبیرناکه‌ت ، سینگ‌و به‌رێ خوه پشتی سیابه‌ندی ناکه‌ته پاوانێ که‌سێکی‌تی ، له‌ورانه نیریێ کیڤی‌و نه‌برایت خه‌جێ‌و نه کوری میزێ خه‌لکێ شیان دلێ هه‌ردوو ئه‌ڤیندارا ژێك ڤه‌که‌ن !!

عه‌هدو په‌یمانێت وان تێك بده‌ن !
هوسا چاڤێت خه‌جێ هه‌ر بو به‌ژنا سیابه‌ندی دمینن ! خه‌جێ خو بسه‌رێ زه‌رێرا گهیاند .
ل سیابه‌ندی کره گازی :

( سیابه‌ندو ، نازکو ، میرخاسو ، ده‌لالو
سبحان گولێ وێ بداره
تو خوه بگره ، ئه‌ز پوڕ کوڕێ
ژوردا بیمه خاره
حه‌تا حه‌تابێ ته‌را ببمه هه‌ڤاله .
سینگێ خوه‌ی ، مه‌رمه‌ری ڤه‌دکه ، بنازی ،
ڤه‌دکه گولبیێ خوه‌یه دریژه
خوه ژوردا زه‌رێدا داڤێژه
سینگێ ویێ زه‌رل‌دارێ دکه‌ڤه ،
دار پشتا پیلێ ویرا ده‌ردکه‌ڤه ،
ئه‌و سیابه‌ند قایم هه‌مێزدکه ،
مه‌رقی ترێ دخوازه وی هشیارکه ،
داروشکێ‌و دوو به‌ند تابێ رحانێ ،
دکه‌ڤته‌ناڤ گولا سبحانێ

ئه‌ڤه به ئه‌ڤینا ڕاست ، هه‌ر ئه‌ڤنه سوزو په‌یمان .

10) وێنێ پول په‌رستی : ـ
ئه‌گه‌ر ئه‌م راست بین دگه‌ل خو ، دڤێت بیژین کو هه‌ر ژکه‌ڤن‌دا هه‌نده‌ك هه‌بووینه پول په‌رست بووینه ، طمع‌و طمع کاری دناڤ‌دا بلاڤ بوویه ، هه‌تا نهو ژی ئه‌ڤ ژانه ئیشه‌ك گرانه دناڤ سه‌دا .
خانی دچه‌رخێ (17) دا ڤی ده‌ردێ گران ده‌ست نیشان ده‌که‌ت‌و دبیژیت : ـ

چیکه‌م کوو قه‌وی که‌ساده بازار
نینن ژقوماشه‌را خه‌ریدار
خاسما دڤی عصری‌دا کوو هه‌میان
معشوق‌و حبیبه بو مه هه‌میان
یعنی ژطمع دراڤ‌و دینار
هه‌ر یه‌ك ژمه‌را وه‌بوونه دلدار

مه‌م زین هه‌ولێر

مابيت ، ڤێجا من تشتەكێ هەی دا بو هەوە بێژم ..
[ هەمی گوهێ خو ددەنێ ] مە گەنجا ئەڤە ژمێژە خولێكدای و كریە دلێ خو كو .. كو .. كو ئاغای بكوژین ..

**حەجی عەلی** : [ سرت رادبیتەڤە ] ئەعوزو بیلاهی منە لشەیتان لرەجیم !!

**سمۆ** : نزا - هوین چ دبێژن ؟

**هەمی** : [ بەرێخو ددەنە ئێك . كت كتە ، پاشی هەمی بپێكڤە ] ئەڤە تشتەكێ پێدڤیە .

**ئاڤدەل** : ولا بابو بەری ئەو سە بكوژیت ئەم دێ وی كوژین .

**سمۆ** : ها مامێ حەجی تو چ دبێژی ؟

**حەجی عەلی** : [ بترس ] ولا ئەڤە تشتەكێ مەزنە و .. و دویر نینە مرنا مە تێرا بیت .. هەكە دێ پێ رابن : هشیاربن هوین بتنێ خو پێڤە نەكەن .. گوندیا ژی تێبگەهینن و ب پێكڤە دێ چینێ .

**سمۆ** : ئێ عەبدلا تو چ دبێژی ؟

**عەبدلا** : برا ئەزێ لگەل هەوە ، بەلێ دڤێت ئەز زوی بچم دا چو هزرا ژ من نەكەت . هەما پشت راست وەرن ئەز دێ لهیڤیا هەوە بم و دێ هەمی تشتا درستكەم .
[ رادبیت ] دێ نوكە بخاترا هەوە [ دەردكەڤیت ]

**سمۆ** : دێ گەلی برا ، رابن دا هەر ژنوكە دەستپێ بكەین و ئیشلا دێ بەرێ سپێدێ وی كوژین .

**حەجی عەلی** : هشیاربن ، حەسوو دەستەكا وی پێ نەحەسێن ها ..
[ سمۆ ب ئیشارەتا وا تێدگەهینیت كا دێ چەوا لسەر گوندیا بەلاڤ بن و كا دێ چ كەن و چ ناكەن . شانۆ تاری دبیت . ]

[[ 7 ]]

[ ناڤ چەمایە . حەسو بپالدان تێتەژورو سمۆ ددیفدا تێت (خەنجەرەكا ڤێ) . حەسو درەڤیت ، هندەك تێنە بەراهیێ . پاشڤە درەڤیت ، هندەكێت دی بەرسینگێ وی دگرن . (هەرئێكی تشتەكێ ددەستیدا - بڤ داس ، مەر ، ... هتد - ) ]

**حەسو** : [ بترس ] ئەڤە .. ڤە .. دێ .. دێ چ كەن ؟!

**سمۆ** : دڤێت تەو دەستەكا تەژی بكوژین . [ ئێك حەسـ دهاڤێتە بەر پێ دی ]

**زەلامێ -1-** : تە بابێ من دا كوشتن .

**زەلامێ - 2 -** : تە برایێ من دا كوشتن .

**عەبو** : تە رەشو دا كوشتن . مە ئاغا كوشت - [ دەستێ درێژ دكەتە جهێ كەلەخێ ئاغای لێ . حەسو دچیت سەحدكەتێ كو یێ كوشتییە دهاڤیت و زوی ڤەدكێشیت ]

**عەبو** : تو دێ چ كەی پشتی وی ؟

**حەسو** : عە - عە - عەبو توژی ؟!!

**عەبو** : ئەرێ ئەژی پاچەوا ، مروڤێ زوردار كەسێ نەڤێت

**ئاڤدەل** : دڤێت خوینمێژێت وەكی هەوە ئادەكەین و سەروژێ ژیانەكا دی ئاڤاكەین بڤیانێ .

**جەرگیس** : یا ژ تەڤە ژیان هەر خارنە ..

**زەلامێ -1-** : دڤێت مروڤی های ژ برایێ خو یێ برسی هەبیت ، چونكی مروڤ بتنێ پێدڤی ژیا نینە . [ هەمی خو نێزیك دكەن ]

**حەسو** : [ خو دهاڤێتە بەر پێت حەجی عەلی و پێلاڤا ماچیدكەت ] حەجی ئەز خولامێ تەمە - نەكوژن - من نەكوژن .

**حەجی عەلی** : [ ئێك ئێكە بەرێخو ددەتە هەمیا . هەمی ئیشارەتا دبێژنێ : دێ كوژین ] دێ دێ بێ لەوتی . [ هەمی تشتێت د دەستێت خـ رادكەن كو دێ پێدادەن ؛ حەسو خو دهاڤـ ناڤ بینەرا ]

**حەسو** : [ دكەنیت ] هە - هە - هە ، رەڤیم [ بو بینەرا ] ڤەشێرن ، من خلاسكەن . [ هەمی پاشڤە دزڤرن

**هەمی** : گەلی بینەرا - شانۆگەریا مە دو پشك بو ، پشكا ئێكێ پێشكێش كرو پشكا دوێ هاتە ناڤ هەوە .

« پەردە »

* ئەڤ چیروكە من ژ فولكلوری وەرگرتیە .

# مێژووی ساڵنامەو ڕۆژمێری کوردی

○

نافیع کاکە

○

## بەشی یەکەم

**مرۆڤ لەناخەوە پێداویستی‌یەکی هەڵگرتووە بۆ پێشوازی شادمانی‌و نەیتوانیوە بەرگری لێبکات بەوە پێوانەکردنی کاتی داهێناوە بە دۆزینەوەی ساڵنامەو ڕۆژانی خۆی بەخشیوە بۆ حەسانەوەو ڕۆژانێکیش بۆ جەژنەکانی**[1]

هەر لەکۆنەوە مرۆڤ پێداویستی ژیان وای لێ کردووە هەوڵی دانانی ئامازو هۆیەکانی ناسینەوەی ئەو ماوە کاتی‌یەی تیایدا ژیاوە بدات ، دەربارەی خولانەوەی چەرخەیەکی تەواوی ساڵ لە کاتێکی دیاری کراوی دەست پێکردنی چەرخەکە تاکو گەڕانەوەی بۆ سەر بارو دۆخێکی وەکو ئەو کاتەی تیایدا دەستی پێ کردووە کەواسە رەتای کەی بێت‌و کۆتایی‌یەکەی چۆن بێت . لە سەرەتادا زۆر بە سادەیی هەستی بە بوونی کات کردووە کەوا چۆن شەوو ڕۆژ بەدووای یەکتردا دێن‌و شەو بۆ خەوتن‌و حەسانەوە ڕۆژیش بۆ بەدووای خۆراك گەڕان ، گۆڕانی دۆخی ئاو وهەواو ساردی‌و گەرمی‌و برسی‌و تینوویەتی کاری کردۆتە سەر کۆچکردنی بەرەو شوێنەوارێکی گونجاوتر بۆی ، لەدایك بوونی منال‌و گەشەکردنی پیربوونی لاوەکان‌و مردنی پیرەکان پێویستی بە ماوەیەك هەیە . بە تێپەڕبوونی هەزاران ساڵ‌و گۆڕانکاری پلە بە پلەی کۆمەلە سەرەتایی‌یەکانی مرۆڤ‌و گۆڕانی چاخەکانی بەردینی‌و ڕاوەشکاری بۆ چاخەکانی کشتوکاڵی‌و جێگربوونی مرۆڤ لە دەوروبەرێکدا پێداویستی مرۆڤی پتر کرد بۆ ناسینی کات سەبارەت بە چۆنیەتی ئاوو هەواو ودرزی چاندن ، دووا بە دووای پەیدابوونی بازرگانیش ئەو پێداویستەی پترکرد[2] ئەو بەڵگانەی یارمەتی ئەوە دەدەن کەوا مرۆڤی کۆن هەوڵی ناسینی کات‌و ساڵژمێری داوە بریتین لەو ئاسەوارە دۆزراوانەی

دێرین ، هەندێ ئاسەوار دۆزراوەتەوە وا دەگەیەنن مرۆڤ لەچاخی سەهۆڵینەوە هەوڵی ناسین و تۆمارکردنی ساڵ ژمێری داوە ، بۆ نموونە لە (ماڵتا) دەکەوێتە سەر رووباری (ئەنگارا) دەسکە گۆزەیەك دۆزراوەتەوە لە کەڵبەی فیلی ماموس دروستکراوە نەخشەی ریزەکانی هێڵی هێلکە شەیتانۆکەی لێ هەڵکەندراوە کەژمارەی هێڵەکان ئەوەندەی ژمارەی رۆژەکانی ساڵە 243 + 122 = 365 شایانی ووتنە ژمارەی یەکەمیان ئەو ماوەیەی ساڵە کەوا بزنەکێوی زاوو زێی تیادا دەکات و ئێستاش راوچی یەکان و بزنەکێوی وانەکانی بستەی باکور بەو جۆرە ساڵژمێری دەکەن ، هەروەها لە (میزین) کە دەکەوێتە نزیك شاری (چیرنیکۆڤ) هەندێ بازنە دۆز رانەتەوە هەر لە کەڵبەی فیلی ماموسن ئەوەندە هێڵی هەڵ کەندراویان لەسەرە کە کۆیان دەکەیتەوە ئەوەندەی ژمارەی رۆژەکانی مانگی هەیڤیان لێ دەردەچێت . شایانی باسە ئەو ناو چانە لە یەکیەتی سوڤیەتن[3] دیسان لە ئینگلتەرە کۆمەڵە بەردی ریزکراوی (ستون هینگ) هەیە باوەڕوایە ئەو بەرد انە ساڵ ـ ژمێرێکە تەنها بۆ رۆژێك ئەو رۆژەش (22) ی یۆنیەیە (تەمموز) کەوا درێژترین رۆژی ساڵە وەرگەڕانی هاوینی بەر (4000) ساڵ لەمەوبەرە ،

ئەوەی گرنگە ریزکردنی بەردەکان روویان لەخۆر هەڵاتە[4] هەروەها گەلانی مایاش کاتی خۆی رۆژ ژمێری هەتاویان بەکار هێناوەو مێژوویان لەسەر تاتە بەردێکی نیمچە ستوونی تۆمار کردووە[5] ئەو باسانە ئەوە دەسەلمێنن کەوا هەر لە زووەوە مرۆڤ ساڵژمێری هەتاوی بەکارهێناوە .

بابلیەکانیش هەر لەزووەوە هەیڤیان بۆ زانینی کات بەکارهێناوەو گرنگیان داوە بە زانیاری یە ئاسمانی یەکان و دابەشکردنی ئاسمان بۆ دووازدە (12) بەشی بازنەیی و بەهەر بەشێکیش ووتراوە (کەلو) هەرکەلوەش لە کۆمەڵە ئەستێرەیەك پێکهاتووە ، گوایە هەر جارەی خۆر دەچێتە یەکێك لەو بەشانە کەوا لایان وابو خۆر دەخولێتەوەو زەوی وەستاوە[6] بابلیەکان هەیڤیان زۆر لا گرنگ بووە ساڵژمێری و رۆژ ژمێریان پێکردووە بۆیەش مانگیان کردوتە چوار (4) هەفتە چونکە لەو ماوەیەدا هەیڤ بەچوار (4) قۆناغدا دەروات تاکو هەموو رووەکانی بەدەر دەکەوێت و وون دەبێتەوە * [7]

میسری یە کۆنەکانیش ساڵنامەی هەتاویان بەکار هێناو... تێبینی ئەوەیان کردبو کەوا هەمو ساڵێك لەیەك کاتدا لافاو... رووباری (نیل) هەڵ دەستا کاتێك بوو کەوا کۆمەڵە ئەستێرە... (شوعەری) پێش هەڵاتنی خۆر بەدیار دەکەوت و ئەو رۆژەیان... کردبووە سەری ساڵ کە رێکەوت بووە لەگەڵ رۆژ... (نەورۆز) ی ئێمەو بەو دووایی یە لەوێدا بە جەژنی (شم... النسیم) دەناسرا * [8] لە ئاسەوارەکانی ئەو وولاتە لە بنمیچ... گۆرستانەکان دۆزراوەتەوە کەوا شوێنی ئەستێرە... (شوعەری) یان تیا کراوە لەگەڵ رووانگەی تەوەردەکانی ئە... کۆمەڵە ئەستێرەیە * [9] هەندێ زاناش لەسەر ئەو رایە... کەوا کۆنترین مێژووی ساڵنامە میسری یەکان تۆماریان کرد... بەر لە (4241) ساڵ پێش زایین * [10] .

پێش دەست نیشانکردنی مێژوویەکی دیاریکراو لە یۆنان... مێژووی رووداوەکانیان بە خولی یاری یەکانی ئۆلەمپیك (olym... دیاری دەکرد ، گوایە هەرقەل (Hercule) دامەزرێنەری ئەو یاریانەیە خولە رێکەکانی لە ساڵی (776) ی پێش زاین را دەستی پێکردووە هەرچوار (4) ساڵ جارێك .. کاتێ دەبو کە خۆر... بەرزترین رادەیدا دەبووو هەیڤیش لە تەواوبوونی رووەکانیدا ئەوەش کاتی کۆتایی مانگی (یۆنیە) بووە واتە (تەمموز) و تاکو نیوەی یەکەمی مانگی (یولیو) واتە (ئاب) دەی خایاند (یاری یەکانی ئۆلەمپیك رۆڵێکی گرنگیان هەبو لە سەردەمی کۆندا بە رادەیەکی وا بەکاریان دەهێنا بۆ دیاریکردنی مێژو ، گوزارەی ئۆلەمپیاد (olyimpiad) بەواتای ماوەی چوار (4) ساڵ دێت کە ئەوەش ماوەی نێوان دوو (2) خولی یاری یەکەیە بۆنموونە ـ لە ساڵی دووەمی دووای خولی ئۆلەمپی... (140) سەدو چلەمدا شەڕ هەڵگیرسا ـ مێژوناسی سەقلییە... (تیمیە ـ Timee) ئەو سیستەمەی خستە ناو ساڵنامەوە کە لە خولی ئۆلەمپیکی (100) سەدەمرا دەستی پێکرد واتە (400) ساڵ دووای یەکەمین خولی ئۆلەمپیك ساڵی 776 پێش زایین بە رێکی دەستی پێ کردو هەرچوار ساڵە جارێك ئەو خولە دەبەسترا *

عارەبەکانی سەردەمی کویردەوریش بو مێژوو ژمێری دەست نیشان کردنی رووداوەکانیان بەکارهێناو وەکو دروست کردنی (کەعبە) لە (1820) پ . ز دا حەزرەتی ئیبراهیمی خەلیل

ـ ڕوستی کرد ، دووای کۆن بوونی ئەو مێژووە ڕووداوی ڕووخانی ئەستێلکی (مەئرەب) یان بەکار دەهێنا کە لە (120) پ . ز ڕووخا ، دووای ڕووداوەکەی (ئەبرەهە) و هێرشەکەی ـەسەر (کەعبە) ئەنجا سالی فیلیان بەکار هێنا بۆ مێژوو ژمێری ـەودش لە سالی (571) زایینی بو کە دەلێن پێغەمبەر (د.خ) لە ـلی فیل لەدایك بووە . یان بەکارهێنانی سالی چاککردنەوەی کەعبە) کە سالی (605) ی زایینی بوو * [12]

ـە کوردەواریش‌دا مێژووژمێری بەو شێوەیە بەکار هاتووە ـەگوێرەی ڕووداوێکی گەورە ، ئێستاش هەندێ کەس ئەوجۆرە ـالژمێری‌یە بەکاردەهێنن بەتایبەتی بەساڵا چووەکان کەوا ـێژوودیاری دەکەن بە گوێرەی گرانی گەورە یان شەڕی عروس و سەفەر بەرلك بۆ نمونە ( 20 سال بەر لە سەفەر بەرلك یان (10) سال دووای سەفەر بەرلك لە فلانە ناوایی‌دا کۆچمان کردە فلانە ـوایی . گرانی گەورە ئەو کارەساتە بوو کە دووای قەتلوعامی ـاعەباسی سەفەوی لە وولاتی موکریان لە سالی 1018 کۆچی 1609 زایینی * کردی‌و خەلکێکی زۆر لەناو چون‌و زۆریش دەربەدەر بوون‌و نەهاتی‌و برسی‌یەتی رووی لەو ناوە کردبوو کاری کردبووە سەر هاوسێکانی ئەو وولاتەش کە هەرگیز لەبیر ناچێتەوە . یاخود شەڕی عروسی یان سەفەر بەرلك چون نەبێتە خالێکی دیاریکراوی مێژوو ژمێری کەوا کوردستان بووە مەیدانی شەڕی سێ سووپای گەورەی تورك‌و رووس‌و ئینگلیزو هاوپەیمانی ئەلمانیا بۆ هیمدادی تورکە عوسمانی‌یەکان * لە سالی 1333 ك / 1914 ی زایینی‌و هەلگیرسانی شەڕی یەکەم کەوا سەری لای کورد ببووە گۆی مەیدان‌و سەفەربەرلکیش مانای بەعیری گشتی دەگرێتەوە لەو رۆژانەوە تێکەلی زمانی کوردی بووە *

گەڕاندنەوەی مێژووی سالنامە یان مێژووژمێری بۆ ڕووداوێك شتێکی ڕێژەیی‌یە هەر گەلە بە گوێرەی ڕووداوەکانی خۆی مێژووژمێری دەکات ، ( بەلام مێژووی سالنامە بەر لە هەرچی بریتی‌یە لە مێژووی بەرەو پێش چوونی ووردی‌یەکەی * [16]

ئەو سالنامانەی کەوا هەر لەکۆنەوە مێژووژمێری پێ دەکرا زۆر هەولیان بۆ درابو بە ووردی مێژووژمێری بکات لەهەموو سالنامەکاندا لە ماوەیەکی کورت‌دا هەست بە بوونی هەلەی نەکراوە بەلام تاکو ماوەی درێژتری بخایاندبایە پتر هەلەی لێ بەدیار دەکەوت بۆیە گەلێ جار دەستکاریان کردووەو ووردیان پتر کردووە .

سالنامەی هەتاوی میسری‌یە کۆنەکان کۆنترین سالنامەیە کەوا (12) مانگ بوو کە (360) رۆژە هەستیان بەوە کردبوو کەهەمو سالێك سالنامەکەیان (5) رۆژ لە کورتی دەدات بۆیە هەموو سالێك هەر لە خۆیانەوە (5) رۆژیان دەخستە سەر وە لەسالی (238) پ . ز بەتلیمۆسی سێیەم بۆ هەر چوار (4) سال رۆژێکی تریشی زیاد کرد بۆ گێڕانەوەی 1/4 رۆژ بۆ هەر سالێك ئەوە دووای ئەوەی هەستیان کرد بەزیادکردنی (5) رۆژ هێشتا سالەکەیان تەواو نابێت ، بەوەوە سال بووە (365) رۆژو بە چوار (4) سال جارێك دەبووە (366) رۆژ * [17] لەسەر ئەو بنچینەیەدا سالنامەی یولیوسی دانرا کەوا بەر لە فەرمانڕەوایی یولیوسی قەیسەر لە رۆمادا سالنامەکەیان بێ کەم‌و کوڕ نەبوو سەبارەت بە پێداویستی‌یەکانی فەرمانڕەوایی‌و رامیاری‌و کارگێڕی بۆیە یولیوس قەیسەر بە یارمەتی فەلەك شووناسی گریکی سۆسیجینس سالنامەیەکی ڕێکخست نەوەك وەکو میسری‌یەکان (5) رۆژ لە خۆیانەوە زیاد بکەن بەلکو سالەکە خۆی (365) رۆژ بێت‌و لەسەر بڕیاری قەیسەر دانرا . هەر چوار (4) سال سالێك (366) رۆژ بێت واتە پڕبێت وە لە یەکەم (1) رۆژی مانگی ینایر (کانوونی دووەم) ی سالی (45) پ . ز دەست بە بەکارهێنانی سالنامەی یولیوسی کرا * [18] سالی پڕیشت ئەو سالەیە کە ڕەنووسەکانی دابەشی چوار (4) بکرێت و ژمارەیەکی تەواو دەر بچێت * [19] دووای ماوەیەك لە سالی (325) ی زایینی لەشاری (نیکیا) کۆرێکیان بەست بۆ بلاوکردنەوەی ئەو سالنامەیە بە وولاتانی مەسیحی‌دا ، بەلام دووای بەسەرچوونی ئەو ماوەیە دەرکەوت کەوا سالنامەی یولیوسی بە پێی پێویست وورد نیە لە دیاریکردنی جەژنەکانی ئایینی و رزگاریدا هەلەی پیشان دەدا بۆیە لەسالی (1582) زایینی پاپای رۆمانی گریگۆری هەشتەم لیژنەیەکی پێکەوەنا بۆ ئامادەکردنی سالنامەیەکی نوێ‌و لە ئەنجامدا بەیارمەتی بەناوبانگترین زانایانی ئیتالیا پرۆژەیەك ئامادەکرا بەوجۆرە دە (10) رۆژیان سال هێنایە پێشەوە کە لەکورتی دابوو بەوەی هەر (128) سال رۆژێك لە کورتی دەدا * ئەو سالنامەیەش بە سالنامەی گریگۆری ناسرا یان زایینی پێ دەلێن .

عارەبەکانی سەردەمی کوێرەوەریش سالنامەی هەیڤیان بەکار

دەهێنا ئەوەش بەسێ (3) ساڵ مانگێك بەرەو پێش دەهات لەماوەیەکی درێژدا هەستیان کرد کەواساڵنامەکەیان لەبەهارەوە بەرەو زستان دێت و (ربیع الاول) و (ربیع الاخر) کە دوو مانگی بەهارین بەتێپەڕ بوونی کات دەکەوتنە وەرزی زستان و وەرزەکانی تر سەبارەت بەوەو بە دیاری‌کردنی کاتێکی جێگر بۆ حەج‌کردن کە هەموو ساڵێك دەبوایە لەیەك کات بێت پێویستیان بەوە بوو ساڵنامەکەیان ڕابگرن بۆیە بەسێ (3) ساڵ یەك (1) مانگیان زیاد دەکرد بەوەوە ساڵی سێ‌یەمیان دەبووە سێزدە (13) مانگ کەهەر دە (10) ڕۆژ بۆ ساڵێك ، دووای هاتنی ئایینی ئیسلام ئەو ڕاگرتنە یاساغ کرا لە لایەن پێغەمبەر (د . خ) کە لەووتاری ڕۆژی (9) ی ذي الحجة ) بەرامبەر موسڵمانەکان و باسی ئەو دوو (2) ئایەتەی بۆ کردن کەوا بۆ ئەو مەبەستە هاتنە خوارەوە : ـ

1 — ان عدة الشهور عند الله اثنا عشر شهراً في كتاب الله يوم خلق السموات والارض ومنها اربعة حرم ذلك الدين القيم فلا تظلموا فيهن انفسكم * [21]

2 — انما النسيْ زيادة في الكفر يضل به الذين كفروا يحلونه عاماً ويحرمونه عاماً ليواطئوا عدة ما حرم الله فيحلوا ما حرم الله زين لهم سوء اعمالهم والله لا يهدى القوم الكافرين * [22] .

واتە لەلایەن خوداوە مانگەکان ژمارەیان دووانزەیە (12) و کەمکردن و زیادکردنیان یاساغە .

بۆ گەڕاندنەوەی مێژوو دووای ئیسلامەتیش هەر بەگوێرەی ڕووداوەکانیان دیاریان دەکرد ، بەلام دووای کۆچی پێغەمبەر (د.خ) لە مەکەوە بۆ مەدینە ساڵی کۆچ کردنیان بەکاردەهێنا کە بە ساڵی یەکەمی کۆچیان دەووت ساڵی (الاذن بالهجرة) وە ساڵی دووەمی کۆچی بە ساڵی (الامر بالقتال) وە ساڵی (الزلازل) بۆ ساڵی پێنجەم و ساڵی (البراءة) بۆ ساڵی نۆیەم و ساڵی (الوداع) * [23] بۆ ساڵی دەیەمی کۆچی کەوا پێغەمبەر (د.خ) لەو ساڵەدا کۆچی دووایی کرد ئیدی ئەوانە هیچیان نەبوونە خاڵێکی دیاری کراو بۆ گەڕاندنەوەی مێژوو بە تەواوی بەو شێوەیە مایەوە تا سەردەمی خەلیفایەتی عومەری کوڕی خەتاب بڕیاری لەسەر ئەوەدا ساڵنامەکەیان بگەڕێننەوە بۆ ڕووداوێکی موسڵمانی بۆیە هەنێك لە یاوەرەکانی پێغەمبەر (د.خ) ویستوویانە ڕۆژی لەدایك بوونی پێغەمبەر (د.خ) بکەنە سەرەتای دەست پێ‌کردن بەلام عەلی کوڕی ئەبو تالیب ڕۆژی کۆچ کردنی لەمەککەوە بۆ مەدینە پەسند کردو هەموو کەوت[ن]ە سەر ئەوڕایە چونکە ڕۆژی کۆچ‌کردن ڕۆژێکی زۆر پیرۆز[و] پرشەنگدارە لە مێژووی موسڵمانیەتی‌دا ، ڕۆژی کۆچ کردنیش ڕۆژی دووشەممە بووە بەبێ گومان کە پێغەمبەر (د.خ) [ل]ە دووشەممەدا نیوەڕۆی (8 / ی ربیع الاول) گەیشتوت[ە] مەدینەی و ئەو بەروارەش بەرامبەرە لەگەل (20) [ی] سێبتێمبەری (تشرین الاول) / 622 ی زایینی * [24]

وە جگە لەو ساڵنامانەی باسمان کردن گەلێ ساڵنامەی تریش هەن وەکو ساڵنامەی قیبتی لەسەر بنچینەی ساڵنامەی میسر[ی] کۆن دانراوە ، ساڵنامەی فارسی کە ساڵنامەی یەزیدی گوردی شەهریار بوو دووا فەرمانڕەوای ساسانیەکان ساڵنامەی جەلال[ی] فارسی کە هی سوڵتانی خۆراسانی جەلالەددین مالك بوو ک[ە] عومەری خەیام و چەند زانایەکی تر ڕێکیان خستبوو [و] ساڵنامەی شۆڕشی فەڕانسەیی وە گەلێك ساڵنامەی تریش ب[ە] گوێرەی هەر گەلەو هەر فەرمانڕەواو ئاینێك هەیە * [25]

گەڕاندنەوەی مێژووی هەر ساڵنامەیەك پێویستە ساڵێکی دیاری کراو بێت و پەیوەندی ئایینی یان مێژوویی لەگەل ئەوگەل[ە] هەبێت کە بەکاری دەهێنێت .

ساڵنامە بەگوێرەی ژماردنی ڕۆژەکانی سێ جۆرە ساڵنامەی هەتاوی ، ساڵنامەی هەیڤی و ساڵنامەی هەیڤ و هەتاوی دەربارەی ساڵنامەی کوردیش سەری ساڵی لە ڕۆژی نەورۆزدا دەست پێ‌دەکات * [26] کە شەوو ڕۆژ بەرامبەرن واتە وەرگەڕانی بەهاری * [27] وە لەبەر ئەوەی ئیمڕۆ نەورۆ[ز] بەگوێزەی ساڵی زایینی دیاری دەکرێت لە « 21 » ی ئازاردا[یە] وەرگەڕانی بەهاری کەوا ڕۆژی یەکەمی ساڵی کوردی‌یە تاک[و] « 20 » ی ئازاری ساڵێکی‌تر ، بۆیە لەژماردنی ڕۆژەکانی و ساڵی ناتەواوو ساڵی پڕ پەیڕەوی ساڵی زایینی دەکات و (1/4 365) ڕۆژ[ە] وەساڵی پڕیشی بە چوار ساڵ جارێك (366) ڕۆژە . دەربارەی گەڕاندنەوەی مێژووی سەرەتای دەست پێ‌کردنی ساڵنامەی کوردی ساڵێکی بۆ دیاری نەکراوەو لە لایەن هیچ کۆڕێکیشەو[ە] بڕیاری لەسەر نەدراوە ، بۆیە ئەو ساڵنامەیە تاکو ئێست[ا] ڕێگەیەکی نەگرتووە بۆبەکار هێنانی ، بەلام بەشێوەیەکی ئاسایی سەرەتای دەست پێ‌کردنی ساڵنامەی کوردی دەگەڕێننەوە بۆ دوو دیاردە * [28] کەوا دامەزراندنی دەوڵەتی مادی و لەدایك بوونی زەردەشتە . مێژووی دامەزراندنی

دەوڵەتی مادی دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی یەکەمی سەدەی حەوتەمی پێش زایینی (650) پ . ز * [29] هەروەها لەوەش ڕاستتر دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی (620 — 610) پ . ز * [30] ئەوەش لەگەڵ ئەوە دەگونجێت کە دەوڵەتی مادی لە ساڵی (612) پ . ز دامەزرابێ * [31]

وە مێژووی لەدایک بوونی زەردەشت دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی یەکەمی سەدەی حەوتەمی پێشزایین * [32] هەروەها زەردەشت لەساڵی (583) ی پ . ز لەتەمەنی (70 — 77) ساڵیدا لە سەر پلیکانەکانی پەرستگای بەلخ کوژراوە * [33] بۆیە 70 + 583 = 653 یان 77 + 583 = 660 ی پ . ز ئەوە دەگەیەنێت کەوا لە نێوان ساڵانی (660 — 653) پ . ز لە دایك بووبێ وە ئەگەر لە و نێوانەش نەبێت ئەوە بێ گومان دەبێت لە (653) ی پ . ز لەدایك بووبێ . بە کۆکردنەوەی مێژووی پ . ز لەگەڵ مێژووی ساڵی زایینی ئەو دوو هاوکێشەمان دەست دەکەوێت

612 پ . ز + 1983 ز = 2595 کوردی مادی 653 پ . ز + 1983 ز = 2636 کوردی زەردەشتی

جگە لەوەی ئەو دوو ساڵەی دەرچوونە ، لە یەکترەوە نزیکن پەیوەندیشیان بەیەکەوە هەیە ، چونکە زەردەشت لە لەلەمڕەوی دەوڵەتی ماد لەدایك بووە * [34] وە خۆشی هەر لەژیاندا بووە کە دەوڵەتی ماد دامەزراوەو ئایینەکەشی لەو وڵاتەدا بڵاوبووەتەوە * [35] .

جا بۆ ساڵنامەیەکی ڕێك نابێت بە ئارەزووی هەرکەسێ یەك لەو دووساڵەی سەرەوە بەکاربێت وەئەگەر بۆ مێژووی دەوڵەتی ماد بەنزیکی (700) ساڵ دانرا * [36] بەهەمان شێوە بۆ مێژووی زەردەشتیش دادەنرێت بۆیە ئەگەر بەنزیکی (400) ساڵ دانرا دەبێت ناوی مادی و زەردەشتی لەگەڵ بەرین یان هیچی لەگەڵ نەڵێین تەنها ساڵی کوردی بۆ بەکارهێنانی ساڵنامەیەکی دیاریکراو وە بەکارهێنانی 700 پ . ز + 1983 ز = 2683 ی کوردی ساڵێکی بەجێیە بۆ ساڵنامەیەکی ڕێك هەروەکو لە هەندێ چاپکراوی کوردیو ڕۆژ ژمێرە کوردییەکاندا بەکار هاتووە . وە ساڵی کوردی لەڕۆژی نەورۆزڕا دەست پێدەکات * (34) کە ئەو ڕۆژەش ڕۆژی یەکەمی مانگی نەورۆزی یە * [38] کە دەکاتە (1 — 1) ی ساڵی کوردی .

ساڵ ژمێریی بەهۆی سوڕانەوەی زەوییە بە دەوری خۆرو خولانەوەی بەدەوری خۆیداو سوڕانەوەی هەیڤ بەدەوری زەوییەوە وەکو کاتژمێرێکی گەورە کە زەوی میلە بچووکەکەی بێتو هەیڤیش میلە گەورەکەی تا زەوی جارێك لە دەوری خۆر دەسوڕێتەوە هەیڤ (12) جار لەدەوری زەوی دەسوڕێتەوەو ڕۆژیش یەکەیەکی پێوانەیی بێت (ڕۆژ یەکەیەکی گشتییە لەوەدەرکەوتنی خۆر لە ئاسۆ ڕا دیاری دەکرێتو بە یەکەیەکی کاتی درێژ دادەنرێت ) * [39] بۆ ئەو مەبەستە لەوەرگەڕانی بەهاریی کە شەوو ڕۆژ بەرامبەرن * [40] دەست دەکەین بە ساڵ ژمێریی تاکو دوو بارە دەگەینەوە وەرگەڕانی بەهارییەکیتر ، وەرگەڕانیش کاتێکە گۆشەی لێدانی تیشکی خۆر لە سەر هێڵی ئاسۆیی گۆی زەوی یەکسان دەبێت واتە تیشکی خۆر ستوون دەبێت لە سەر هێڵی یەکسانی ئەوەش تەنها ماوەی شەوو ڕۆژێکە ، وەرگە ڕانی بەهاری لە « 21 » ی ئازاردایە کەوا ڕۆژی نەورۆزە . شەش « 6 » مانگ دووای وەرگەڕانی بەهاریی ئەنجا وەر گەڕانی پاییزییە لە « 21 » ی ئەیلولدا وە بە ماوە کاتی نێوان دوو وەرگەڕانی بەهاریی دەووترێت ساڵ ، ( ساڵ بەوە دەپێورێت خۆر لە ئیعتیدالی ڕەبیعیدا تێ پەڕی کرد کە بە (365 . 24199) ڕۆژی شەمسی بە شێوەیەکی تەقریبی دەست نیشان دەکرێت ) * [41] واتە ساڵ بریتییە لە سوڕانەوەی زەوی بەدەوری خۆردا لەڕۆژی وەرگەڕانی بەهاریڕا « 21 » ی ئازار تاکو دەگەینەوە وەرگەڕانی بەهارێکیتر لە « 21 » ی ئازاردا ئەو سوڕانەوەیەش (365 1/4) ڕۆژ دەخایەنێت یاخود (365) ڕۆژو (5)° کاتژمێرو (48̄) خولەکو (46˝) چرکە * [42] .

کەواتە لەو ماوەیەشدا زەوی (365 1/4) جار بە دەوری خۆیدا خول دەخواتو خۆری لێ هەڵ دێت ، وە لەو ماوە سوڕانەوەیەدا خۆر (12) بەشی یەکسان دەبڕێت ( کە جاران باوەڕ وابو زەوی وەستاوەو خۆر دەسوڕێتەوە ) کە بریتییە لە جغزێکی خەیاڵی دابەشکراو بۆ (12) بیرۆ (berou) کە یەکەیەکی (30°) پلەکییە * [43] وێنەی یەکەم . وە پەهەر بەشێکیان وتووە کەلو (برج) کە هەر یەکەیان لە کۆمەڵە ئەستێرەیەك پێکهاتووەو شێوەی چەند شتێکیان دروست کردووەو ناوی ئەو شتەیان لێنراوە کە کۆمەڵە ئەستێرەکانی بەگوێرەی هەڵکەوتنیان دروستیان کردووە . ئەستێرە ناسەکانی کۆن ئەو (12) کەلوەیان بەسەر (4) توخمی ( خاك . با . ئاو . ئاگر ) دا بەشکردووەو هەر

(3) كەلويان داوە بە يەكێك لەو توخمانە بەو شێوەيە : ـ

أ ـ كەلوى ئاوى كە ميجازيان ساردو تەرە ـ قرژال ، دووپشك ، نەهەنك ، ب ـ كەلوى ئاگرى كە گەرم و وشكن ـ شەك ، شێر ، كەوان . ج ـ كەلوى باى كە گەرم و تەڕن ـ جمك ، تەرازوو ، دۆلچە .

د ـ كەلوى خاكى كە ساردو وشكن ـ گا ، فەريك ، گيسك * [44] .

**يەكەم** : ـ كەلوش كەلووى شەكە كاتێ يەكەم ڕۆژ خۆر دەچێتە ئەو كەلوە بريتىيە لە وەرگەرانى بەهارى « 21 » ى ئازارو جەژنى نەورۆز لە كەلووى شەكەوە شەشيان (6) يەك لە دوواى يەك دەكەونە باكورى هێڵى يەكسانىيەوە كە ئەوانەن ـ شەك ـ گا ـ جمك ـ قرژال ـ شێر ـ فەريك ـ شەشەكەى (6) تريش لە دوواىيەك ئەوانەن ـ تەرازوو ـ دووپشك ـ كەوان ـ گيسك ـ دۆلچە ـ نەهەنگ . دەكەونە خوارووى هێڵى يەكسانى وەك دێتە بەرچاو لە ساڵێكدا خۆر بەهەر (12) كەلوودا دەڕوات * [45]

**وێنەى دووەم** : وە ئەو ماوە كاتىيەش كەخۆر نێوان دوو كەلوو دەبڕێت ( ڕاستىيەكەى ئەوماوە كاتى يەى زەوى ئاستى نێوان دوو كەلوو دەبڕێت ) بەنزيكى يەكسان دەبێت لەگەڵ ئەوماوە كاتى يەى هەيڤ دەيخايەنێت بۆ دروست بوونى هەموو ڕووەكانى واتە لە هەيڤى يەكشەوىيەوە تاهەيڤى شەوى كۆتايى .

**وێنەى سێيەم** : سەبارەت بە هاوڕێژە بوونى سوڕانەوەى هەيڤ بە دەورى زەوىو سوڕانەوەى زەوى بەدەورەى خۆرو خول خواردنى زەوى بەدەورى خۆيدا ڕۆژو هەفتەو مانگو ساڵ پێك دێت . ( ئێمە لەسەر زەوى كات بە ڕۆژو بەشەكانى ـ كاتژمێرو خولەكو چركە ـ يان بە ڕۆژو چەندجارەى ـ مانگو ساڵو سەدە دەپێوين ڕۆژيش ، كاتێكە زەوى لە خولانەوەى بە دەورى خۆيدا دەيخايەنێتو ساڵيش كاتى خاياندنى سوڕانەوەيەتى بەدەورى خۆردا كەوا (1/4 365) ڕۆژە * [46] .

**وێنەى چوارەم** : ماوەى سوڕانەوەى زەوى بە دەورى خۆردا 24199 . 365 ڕۆژە دەخايەنێتو سوڕانەوەى هەيڤيش بە دەورى زەويدا 36706 . 354 ڕۆژ دەخايەنێت ئەو دوو ژمارەيەش يەكسان نينە بەڵكو لەيەكتر نزيكنو جياوازيان نزيكەى (10) ڕۆژە سەبارەت بەوەيە ساڵى هەيڤى هەموو ساڵێك (10) ڕۆژ لەكورتى دەدا يان دێتە پێشەوە تا واى لێدێت بە (3) سێ ساڵ يەك مانگ لە كورتى دەدات ياخود يەك مانگ دێتە پێش بۆيە هەر (33) ساڵ هەيڤى يەكسانە بە (32) ساڵى هەتاوى * [47] هۆى ئەوەش ئەوەيە كەوا ڕۆژى هەتاوى ياخود ڕۆژى خۆرى (24) كاتژمێر درێژە بەلام ڕۆژى هەيڤى (24) كاتژمێرو (56) خولەك درێژە * [48] چونكە زەوى بە (24) كاتژمێر جارێك لە دەورى خۆى خول دەخوات بەلام هەيڤ بە (24) كاتژمێرو (56) خولەك جارێك لە دەورى زەوى دەسوڕێتەوە .

دابەش بوونى ساڵ بۆ (12) مانگ هەر ئەوەيە كاتى خۆى بابلىيەكان بەكاريان هێناوە بەوەى لە ماوەى يەك ساڵدا خۆر (12) كەلووى جياواز دەبڕێت .

**وێنەى پێنجەم** هەيڤيش (12) جار پڕ دەبێت بەگوێرەى هەر نيو گۆيەكى زەوى . وە دابەشكردنى مانگيش بۆ چوار (4) هەفتە سەبارەت بە پەيدا بوونى ڕووەكانى هەيڤەكە بە (4) قۆناغ دەڕوات كەوا لە هەيڤى يەكشەوى تا نيوەتابانو قۆناغى دووەميش دەبێتە هەيڤى تابان كەوا هەفتەى دووەمە ئەنجا دووبارە ڕووى هەيڤ كەم دەبێتەوەو لەهەفتەى سێيەم دەبێتەوە نيوە تابان ئەنجا چواريەكەكەى تريشى لە قۆناغى چوارەمدا كە هەفتەى چوارەمە كۆتايى دێتو ون دەبێ دەربارەى ناونانى ڕۆژەكانى هەفتەش لەبەر چەند هۆيەكى ئايينى بوە لاى بابلىو ڕۆمانەكان* [49] كەوا خۆرو هەيڤو پێنج (5) ئەستێرەى ترى كۆمەڵەى خۆريان * [50] ناسيوەو لايان زۆر پيرۆزبووە سەبارەت بە بيرە ئەفسانەيى يەكانيان . بۆيە بە هەريەكە لەو هەسارگە ئاسمانىيانە ڕۆژێكيان تەرخان كردووە ئەوانەش ژمارەيان (7) بووە . وە هەريەكە لە ڕۆژەكان ناوى ئە هەسارگەى لێنرابوو كەوا بۆيان تەرخان كرابوو تاكو ئيستاش هەر لەسەر ئەو شێوەيە ماوە جگە لە خۆرو هەيڤ ئەستێرە (مەريخو عەتاريدو مشتەرىو گەلاوێژ (زوهرە) و زوحەل ) يا ناسيوەو * [51] هەر ڕۆژەيان بە خوداى يەكێ لەو شتانە داناو كە باوەڕيان پێى هەبووە

1 — خۆر sun ڕۆژى خواى خۆر sunday يەكشەم

2 — هەيڤ moon ڕۆژى خواى هەيڤ moonday دووشەم

٣ — مەریخ mars ڕۆژی خوای شەڕ tuesday سێ شەم
٤ — عەتارید mercury ڕۆژی خوای باو بۆران Wednesday چوارشەم
٥ — مشتەری Jupiter ڕۆژی خوای تریشقە thursday پێنج شەم (کاروان کوژە)
٦ — زوهرە Venus ڕۆژی خوای جوانی Friday هەینی (گەلاوێژ)
٧ — زوحەل satur ڕۆژی خوای کشتوکاڵ Saturday شەمموو
دەربارەی ناوە کوردییەکەش هەر (7) ڕۆژی وان وەرگیراوە بە ژماردنی شەوو شەوی یەکەم و دووەم و ..
دەربارەی ناوی مانگەکانی ساڵی کوردی کە دووانزە (12) مانگن هەر یەکە ناوی تایبەتی خۆی هەیە کە بەرێک وبێکی لە گەڵ ئەو کات و دەمەی وەرزی ساڵ دەگونجێ و واتاکەشی هەر لەو کات و دەمە هاتووە بەپێی دۆخ و باری سروشتەوە * [52] بەلام ئەوە نەبێت هەندێ ناوەکانی لە شوێنێک بۆ شوێنێکی تر دەگۆرێت بە پان و بەرینی وولاتەکەمان و تۆپۆگرافیای ناوچەکان و جیاوازی ئاوو هەواو کەمی هۆیەکانی بلاوکردنەوە سەرەڕای ئەوەش جیاوازی ناوەکانی یەك مانگ لەگەڵ یەکتر کارێکی وا ناکاتە سەر ئەو کات و دەمەی ناوەکانی ناو لێنراوە چونکە هەر ناوەی دانراوە بۆ هەر کاتێك لە هەمو بارەکیانەوە پڕ بە پێستن لە گەڵ کات و دەمەکەی . بەلام سەبارەت بە ڕۆژ ژمێرێکی ڕێك دەبێت یەك لە ناوەکان پەسند بکەین کەوا کامیان زیاتر دەگونجێت یان زیاتر بەکار دەهێنرێت یاخود کام ناو بەردەوامی زیاترە بەپێی درێژی مانەوەی کاتەکەی بۆ نمونە مانگی یەکەمی ساڵ چەند ناوێکی هەیە (خاکەلێوە ـ ئاخەلێوە ـ ئادار ـ نەوروز) خاکەلێوەو ئاخەلێوە هەردووکیان یەك واتان و یەك ناون جیاوازییەکەیان لە (خاك ـ ئاخ) دایە بە جێ گۆرکێی پیتەکان لەگەڵ یەکتر بووەتە دوو ناو هەردووانیش بەواتەی (خۆڵ ـ زەوی ) دێن . کەوا لە ( خاك + لێو ) یان (ئاخ + لێو) بەیارمەتی ئینتەرفێکسی (°) دروست بوونە بەواتای خشاندنی لێوی ئاژاڵ بە خاك لەکاتی لەوەڕان سەبارەت بە پەیدابوونی گیاوگوڵ و سەوزایی . دەبینین (خاکەلێوە) بەردەوامی مانەوەی کاتەکەی زۆر نییە چونکە ئەو کاتەی مەبەستە تەنها بۆ سەرەتای شین بوونی لەوەڕ (گیاوگوڵ) گیاوگۆڵیش هەروا بەکورتی و ساوایی نامینێتەوە بەلکو بە ماوەیەکی کورت کاتێ سەری خۆی لەخاك دەرهێنا دەبێتە لەوەڕێکی تەواوو لەخاك بەرزدەبێتەوە ئەگەر ئاژاڵ بشی خوات لێوی لەخاگ ناخشێ ناوی (ئادار) یش لە (ئاو + دار) دروست بووە کەوا ناوێکی لێکدرواەو لەدوو ناوی سادە دروست بووە کە لەوکاتەی ساڵ پەیوەندی نێوان (دارو ئاو) زیاد دەکات و دار تەڕاتی بە لەشیا دادێت و دەست بە چەکەرەدانی دەکات . سەرەڕای ئەو ناوانەی باسکران ناوی (نەوروز) زۆر بلاوو ڕوونە کەس نیە نەیانزانێ لە کام کاتی ساڵدایە بۆیە زیاتر جێی خۆی گرتووەو پەسندتر کراوە ، بەوجۆرە ناوی مانگەکانی تریش گونجاوترینیان پەسند دەکرێت ، ناوی مانگەکان ناوی لێکدراون و لەسەر چەند بنچینەیەك دروست بوونە لە هەندێکیاندا (ان) ی کۆ یارمەتیان دەدات دەیان هێنێتە سەر شێوازی کاتی و هەندێك ناوی تریش سادەنەو بەیارمەتی (ان) ی کۆ دروست بوونە : ـ
ناوی سادە + (ان) ی کۆ : گولان ، خەرمانان . زەخیران * [53]
دوو ناوی سادە : ئادار ، ڕەزبەر ، ڕێبەندان . گەلاخەزان * [54]
دوو ناوی سادە + ئینتەرفێکسی (°) :بانەمەڕ ، خاکەلێوە ، بەختەباران * [55] .
ئاوەڵناو + ناوی سادە : نەوروز ، سەرماوەرز * [56]
ئاوەڵناو + ئینتەرفێکسی (°) + ناوی سادە : شەستەباران ڕەشەمێ * [57]
ناوی سادە + ئاوەڵناو : جۆزەردان ، پووشکاڵ ، گەلاڕێزان .
ناوی سادە + ڕەگی فرمان : بارانبران ، بەفرانبار (بەفرباران) پووشپەڕ ، خەزەڵوەر * [58] .
ناوی مانگەکان زۆری سەبارەت بە چۆنیەتی باری کەش و ئاوو هەواوە ناونراون کە دانیشتوانەکەی خەریکی کشتوکاڵ و ئاژەڵدارین و هەروەها هەڵکەوتنی شوێنی ولاتەکەو باری تۆپۆگرافیای ڕووەکەی وای کردووە شوێنێك لەگەڵ شوێنێکی تر جیاوازی هەبێت لەبارەی پلەی بەفرو باران بارین و پالەپەستۆو پلەی گەرمی ئاوو هەواوە هەر ناوەش سەبارەت بەو هۆکارە سروشتییانەوە ناونراون وەکو مانگەکان باران بران ، بەختەباران ، شەستەباران ، بەفرانبار ، ڕێبەندان ، ئادار ) سەبارەت بە باران بارین و بەفربارینەوە ناونراون . مانگەکانی (خاکەلێوەو گولان ، بانەمەڕ ، جۆزەردان ، ڕەزبەرو

بەڕوبەز ) سەبارەت ڕووان و پێگەیشتن و بەردانی بەرهەمی کشتوکاڵی یەوە ناونراون و مانگەکانی (گەلاڕێزان ، خەزەڵوەر ، پووشکال ، پووشپەڕ ، سەرماوەز ) سەبارەت بە گۆڕانی پلەی گەرمایی و کارکردنی لەسەر ڕووەکەوە ناونراون هەر وەکو حەوتەکانیش هەر لەبەر نزمی پلەی گەرمایی یەوە ناونراون وەکو (بەند و بەندرخە ، پیت و پالۆس .. ) . بەوانەوە دەر دەکەوێت کەوا ڕۆژمێری کوردی لەسەر بنچینەی کەش و ئاوو هەواوە دانراوە سەبارەت بەڕووان و گەشە کردنی بەرهەمی و کشتوکاڵی و ئاژەڵداری یەوە گرنگی بە ئاوو هەواو کەش دراوە بۆ ناسینەوەی کاتی ساڵ و ناو لێنانی ناوی مانگەکان بەوجۆرەوە سەبارەت بەوە لێرەدا نەختێك ئاوو هەوای وڵاتەکەمان ڕوون دەکەینەوە وڵاتەکەمان کەوتۆتە نێوان هێڵێ پانی (34 — 38) پلەك و هێڵێ درێژی (42 — 46) پلەکی ڕۆژهەلات * [59] .

ئاوو هەوای دەریای سپی ناوەڕاستی هەیە لە زستاندا ناوچەکانی ڕۆژ هەلاتی ناوەڕاست پاڵەپەستۆیە کی بەرزی لێ پەیدا دەبێت هەتا ساردتربێت پاڵەپەستۆکەی زۆرتر دەبێت بەوە پردێك لەنێوان باکوری عیراق و باکوری ئەفەریقاوە پێك دێت و گرنگی یەکی زۆری هەیە بۆ گەیشتنی هەوری بەباران بۆ کوردستان . ئەو شەپۆلە لە زستانڕا دەست پێدەکات و بەرەو دەریای سپی بەڕێگایەکی نەگۆڕ دەڕوات لەڕۆژئاوای دەریای سپی یەوە لەناوچەی کەنداوی (لیۆن) دەست پێدەکات ئەوشەپۆلە لە زەریای ئەتلەسی یەوە پێك دێت و بەرەو دەریای سپی باز دەدات بە ڕێگا نەگۆڕەکەی لە ڕۆژهەلاتی دەریای سپی یەوە کەنارەو کەناردەریا بەرەو ڕۆژاوای دەڕوات تا دەگاتە قەراغەکانی دەریای تورکیا ، لەکاتی بەهێز بوونی شەپۆلەکە بەئاسانی دەتوانێت بە شاخەکانی تۆروس و لوبنان دەربازبێ و بگاتە شاخەکانی کوردستان ، بەلام ئەگەر شەپۆلەکە بێهێزبوو ئەوە ناتوانێت بگاتە ئەو ناوچەیە بۆیە ساڵ هەیە باران لە وڵاتەکەمان زۆرەو ساڵیش هەیە باران کەمە بەگوێرەی هێزی ئەو شەپۆلەی پێك دێت ، لەبەر ئەوەی ئەو شەپۆلانەی دەریای سپی دەگەنە وڵاتەکەمان و کار لە ئاوو هەوای وڵاتەکەمان دەکات دەوترێت ئاوو هەوای دەریای سپی ناوەڕاست کە زستانی زۆر ساردو شێدارە بەشەو پلەی گەرمایی زۆر جار دەگاتە (ژێر سفر) * [60] هاوینێکی گەرمی

هەیە بەتایبەتی لە ناوچەی گەرمیانەوە بەهارو پایز لە ناوچەی گەرمیانەوە زۆر کورتە کە بەهار نزیك بووەوە ئیتر باران و هەتاو لەیەگ نزیك دەبنەوە ڕۆژ هەیە چەندەها جار باران دەبارێت و هەتاو پەیدا دەبێتە وە * [61] بەوکاتەی ساڵ یاخۆد بەو مانگە دەڵێن (شەستەباران) بەو شێوەیە کۆتایی دێت بەکەم بوونەوەی باران بەگشتی لەسەرەتای مانگی نیسان تامانگی

مایس دەوام دەکات * [62] بەگوێرەی ڕۆژژمێری کوردی دەکاتە مانگی (گوڵان) زۆرجار تا کۆتایی مانگی مایس (مانگی جۆزەردانی کوردی) جاروبار باران دەبارێت * [63] بۆیە بەو دەمەی ساڵ دەڵێن (بەختەباران) ئەوە بەزۆری لە کوێستاندا یاخود لە خوارووی کوێست ! دەبێت . لەدەشتەکانی

گەرمیانەوەو ئەو ناوچانەی وەکو ئەون بەگوێرەی ئاوو هەواوە تەنیا دوو وەرزی هاوین و زستان بەڕوونی لەیەکتر جیا دەکرێنەوەو لەنێوان ئەو دوو وەرزەدا کاتێکی زۆر کورت هەیە کەوا دوو تا چوار هەفتە دەوام دەکەن ئەوانیش بەهارو پایزن * [64] ئاوو هەوای کوێستان زستانی درێژەو زۆر ساردە

باران و بەفری زۆرە بەهاری دووا دەکەوێت و زۆر کورتەو هەر دەکەوێتە سەر حیسابی زستان زۆر جاریش پلەی گەرمایی دەگاتە (ژێر سفر) تا مانگی مایس (واتە گوڵان) هەر ساردو وشکە * [65] هاوینی لە حوزەیرانەوە (پووشپەڕ) دەست پێدەکات تا مانگی ئەیلول (ڕەزبەر) ەوە ئەوە لە خوارووی کوێستان و تاکو بەرەو باکور بچین پلەی گەرمایی نزمتر دەبێتەوە بۆیە زستان لەباکوری کوێستان درێژە گۆڕانی ئاوو هەواو

دابەشبونی بەر جۆرە سەبارەت بە باری جوگرافی و شێوەی تۆپۆگرافی ڕووەکەی وای کردووە لە هەندێ ناوچەی وڵاتەکەمان زستان درێژترە لەهاوین ئەوە لەناوچەی باکوری کوێستانەکاندا یاخود هەردوو وەرز وەکو یەکن وەك لەناوچەی خوارووی کوێستاندا یاخود هاوینی درێژترە هەروەکو لە ناوچە گەرمیانەکان و جا لەبەر درێژبوونی زستان و هاوین و بە پێچەوانەوە وادەکات وەرزەکانی بەهارو پایز زۆر کورت بن کەوا لەچەند هەفتەیەك تێپەڕ نەکەن لەهەندێ ناوچەش تەمەنی بەهارو پاییز تەواوە ، بۆیە کورت و درێژی وەرزەکان بەگوێرەی

ناوچەکانی ولاتەکەمان دەگۆڕێت بەلام لێرەدا سەبارەت بە ڕۆژژمێری تێکڕایی مانگەکان‌و وەرزە کان وەردەگرین‌و هەر وەرزەش سێ مانگە ، وە دەربارەی پلەی گەرمایی هەریەکە لەمانگەکان تائێستا هیچ سەرژمێریەکی تەواو نەکراوە لە ولاتەکەماندا بەلام بە شێوەیەکی نزیکی خشتەی ژمارە (1) ئەوە

ڕوون دەکاتەوە کەوا بۆ مانگە کوردی‌یەکان ڕێکم خستووە کە تاکو ئێستا بۆ مانگە کوردی‌یەکان نەکراوە بەلام تێکڕای پلەی گەرمی مانگەکانم وەرگرتووەو لە تێکراي پلەی گەرمی مانگە زانیاری‌یەکانم وەدەست هێناوە * [66]

## پەراوێزەکان

1 — گۆڤاری (الهدف) مصري سالی 3 ژمارە 125 ل 2499
2 — گۆڤاری (الزمن) بيروت سلسلة كيف ولماذا ل 7
3 — پاشکۆی ڕۆژنامەی عیراق بە کوردی ژمارە 17 ل 12
4 — گۆڤاری (الزمن) سلسلة كيف ولماذا بيروت ل 2

5 — هەمان سەرچاوە . ل 3
6 — هەمان سەرچاوە . ل 7
7 — علوم البابليين ـ مرغريت روثن . تعريب د. يوسف حبي ل 87
8 — گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق بەرگی 7 ل 450
9 — 10 ـ گۆڤاری (الزمن) بيروت سلسلة كيف ولماذا ل 12
11 — گۆڤاری (المعرفة) مصري ژمارە 25 ل 401

12 — گۆڤاری (العلم والحياة) بغداد ژمارە 10 ل 15
13 — حاجی قادری کۆیی مەسعوود مەحەمەد بەرگی 2 ل 325
14 — گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد بەرگی 2 بەشی ا ل 200
15 — هەمان سەرچاوە ل 202
16 — پاشکۆی ڕۆژنامەی عیراق کوردی ژمارە 17 ل 12
17 — گۆڤاری (الزمن) بيروت . ل 12

18 — هەمان سەرچاوە . ل 14
19 — التقويم الهادي بيروت دكتور محمد صالح البنداق ل 47
20 — پاشکۆی عێراق . ژمارە 17 ل 12
21 — قورئانی پیرۆز سورەتی (توبة) ئایەتی 36
22 — هەمان سەرچاوە . ئایەتی 37
23 — گۆڤاری (العلم والحياة) بغداد ژمارە 10 ل 16
24 — 25 — تقويم الهادي بيروت دكتور محمد صالح البنداق ل 53

26 — گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق بەرگی 7 ل 458
27 — گۆڤاری (الزمن) . ل 7
28 — هەندێك چاپكراوی کوردی عەلائەدین سەجادی ، گیوی موکریانی .
29 — میدیا ... وەرگیرانی بۆ کوردی برهان قانیع ل 405
30 — میدیا وەرگیرانی برهان قانیع . ل 406
31 — قامووسی زمانی کوردی زەبیحی بەرگی ا ل 33
32 — 33 ـ دەقەکانی ئەدەبی کوردی عەلائەدین سەجادی ل 16
34 — گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد بەرگی 3 بەشی 2 ل 578

35 — هەمان سەرچاوە . ل 580
36 — ڕۆژژمێری هاوسەرو پیرەمێرد .
37 — گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق بەرگی 7 ل 458
38 — هەمان سەرچاوە . ل 392
39 — النسبية پول كوديرك . ترجمة مصطفىٰ الدقى (بيروت) ل 31
40 — گۆڤاری (الزمن) . ل 47

41 — گۆڤاری کولێجی ئەدەبیات دکتور ئەحمەد عوسمان ژمارە 21 ل -
42 — گۆڤاری (الزمن) . ل 21
43 — ـ علوم البابليين مرغريت روثن ترجمة د . يوسف حبى ل 103
44 — قامووسی زمانی کوردی زەبیحی بەرگی ا ل 69
45 — تەفسیری خاڵ جزمی سێیەم چاپی دووەم شیخ محەمەدی خاڵ ل 66
46 — الكون الاحدب بيروت محمد عبدالرحمن مرحبا في النظرية النسبية ل 28

47 — گۆڤاری کولیجی ئەدەبیات دکتور ئەحمەد عوسمان ژمارە 21 ل -
48 — گۆڤاری (العلم والحياة) بغداد ژمارە 7 ل 17
49 — گۆڤاری (الزمن) . ل 10
50 — صورة الكون موسوعة صغيرة بغداد محمد عبداللطيف مطلب ل 26
51 — هەمان سەرچاوە . ل 33 — 34
52 — دیوانی خادیم بەرگی دووەم جەمال مەحەمەد ئیسماعیل
1981 ل — 266 — 267 — 268 — 269

53 — ڕێزمانی کوردی مۆرفۆلۆژی (ناو) ئاورەحمانی حاجی مارف ل 147
54 — 55 — هەمان سەرچاوە . ل 134
56 — 57 — 58 — هەمان سەرچاوە . ل 135
59 — شۆڕشی کشتوکاڵ پاشکۆی کوردی ژمارە 14 ل 9
60 — 61 — 62 — 63 — هەمان سەرچاوە ژمارە 14 ل 14
64 — هەمان سەرچاوە . ژمارە 14 ل 15
65 — هەمان سەرچاوە . ژمارە 14 ل 17
66 — هەمان سەرچاوە . ژمارە 2 ل 61

# کـاروانـی ڕۆشـنـبـیری لەکوردستاندا

## لــە هــەولێــر

○

ئامادەکردنی : شوان

○

### [ پێشانگای هونەرمەند سەردار سنجاوی ]

لە 22 — 28/ 11/ 1983 کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی کورد لقی هەولێر لەهۆڵی قوتابخانەی ئەیوبیە دووەمین پێشانگای تایبەتی بۆ هونەرمەند سەردار سنجاوی کردەوە . پێشانگاکە بریتی بوو لە [ 32 ] تابلۆ ... بە شێوەیەکی گشتی تابلۆکان زەیتیو واقیعی بوون ...

تەمەنی کـاری تابلۆکـان لەنێوان سـاڵانی 1979 — 1983 دابوون هونەرمەند سەردار وەك لاوێکی تازە پێگەیشتو عاشقی هونەرێکی بەرزەو بەقوناغێکی ناسکی تەمەنیدا تێدەپەڕێ ، خـەریکی خۆپێگـەیانـدنەو لە گـورەپانی تـاقیکردنـەوەیەکی سەختدا ئەسپی خۆی تاوداوە ، ڕەنج دەداو هەوڵو تەقەلای خۆی بەخت دەکـات ، لەوپێناوەی خـۆی بدۆزێتـەوە ، جێ پـەنجەو شـوێن دەستی خۆی لەدنیـای هونـەری ڕەسـەنی کوردیدا بکاتەوە .

سەرداری هونەرمەند هیچیەك لەڕێبازە هونەرەیـەکانی فەرامۆش نـەکردووەو ریـالیزمی شـۆرشگێرانـەی لەپێش چاو داناوە .

تابلۆکانی خەیاڵێکی قوڵیان تێدایە ... تاسەرنجیان وردتر لێ بدرێت دنیای تازەو تازەتـری تێدا دەدۆزێتـەوە کارەسـات لەلات خەستر دەبێتەوە .

بەهرەی هونەرمەندانە بەتـابلۆکانـەوە دیارنو خـۆیان هاوار دەکەن ، گونجانی ڕەنگ هاوجـووت لەگەڵ (ضـربات فلچەدا دەڕۆنو خزمایەتیان لە نێواندایە ....

ڕێبازی ریالیزمی تەواو زاڵەوڕەنگیان بەسـەر زۆربەی تـابلۆکانـدا داوەتەوەو لەشێـوەی تەکنیکی نـوێدا خـۆیان دەنوێنن .

### [ هەڵزنان بەدنیای تابلۆکاندا ]

ژمارە . ناوی تابلۆکان

1 — هەڵویست

2 — منیش تەنیاییم خۆش ناوێت

3 — سروشت .

4 — دووحاڵەت

5 — مرۆڤو ئازارەکانی







٤ — پۆرتریت
- — پەناهێنان
8 — گوندێك
9 — لە تابلۆیەكدا
10 — كەركوك لە شەودا
11 — دیمەنێكی شاخاوی
12 — لە مەهاباد
13 — پێكهاتن
14 — هەنگاو بەرەو خۆر .
15 — دیاردەیەك .
16 — دڵنیابە « بۆكان هەمیشە سەربلندە »
17 — گوندی عەلی یەرەش
18 — بەرەو لوتكە .
19 — ئاشیش لەگەڵمانە .
20 — پورتریت .
21 — مرۆڤ .
22 — تێروانین .
23 — لە باوەشما حەزەكانت دەپارێزم .
24 — بەرەو گەرمیان .
25 — دیمەنێك .
26 — گوندی قووچ .
27 — لە ژیانی قوتابی یەتیمدا
28 — ئەڤین .
29 — سرووشت .
30 — دووحاڵەت .
31 — ئێوارە گوندێك

## [ ناوەڕۆك یا ناخی تابلۆكان ]

* منیش تەنیاییم خۆش ناوێت : ژنێكی هەژارو رووتەڵە لە ژوورەكەی خۆیدا لە تاو سەرما هەڵتروشكاوە ... لێقەوماوی خۆی دەرنەخات ، بەڵام ناپارێتەوە وخۆی بۆ بەرگری جەوری نەهات ئامادە دەكات .
* هەڵوێست : تابلۆیەكی واقیعیە وگیانی زیندویتی بەبەردا كراوە ؛ كۆمەڵە ئافرەتێك روو بەرووی خەمێكی گەورە بوونەتەوە هاو ئازاری یەكی پێ گرتوون ، ناهەقی رەت دەكەنەوە ، بۆیە پێیان لە زەوی داگرتووە بە دەنگی بەرز روو بەرووی ستەمكار دەبنەوە .
* هەنگاو بەرەوخۆر : كۆمەڵە مرۆڤێك روویان لە تیشك و رووناكی خۆر كردوە ، بەوردی بیر لە هەنگاونانی داهاتیان دەكەنەوە .
* پەناهێنان : دایك كوری لە باوەش كردوە ، مەسەلەیەكی قوول دیاری ئەكات ، كە دایك و كورو هەرگیز لە یەك دانابڕین .

**« هونەرمەند سەردار سنجاوی »**

* ساڵی 1964 لە شاری كەركوك ـ گەرەكی ئیسكان چاوی بۆژیان هەڵهێناوە .
* پلەكانی قوناغی قوتابخانەی ؛ سەرەتایی ، ناوەندی ، ئامادەیی لە شاری هەولێر تەواو كردوە .
* ئێستا قوتابی یە لە پۆلی یەكی پەیمانگای تەندروستی باڵا لە هەولێر .
* سەعدی برای كە هونەرمەندو وێنەكێشە كارێكی گەورەی كردۆتە سەری و بە گەرمی هانی داوە هۆگری ئەم هونەرە ناسكە بێت .
* بەشداری لە پێشانگاكانی چالاكی قوتابخانەكاندا كردوەو تابلۆكانی نیردراوە بۆبەشداری پێشانگای قوتابخانەكان لە بەغا .
* ساڵی 1979 یەكەم پێشانگای تایبەتی خۆی لە هەولێر كردۆتەوە .

## [ بەیتی شۆڕ مەحموود ]

لە چوارچێوەی چالاكی یە رۆشنبیری و ئەدەبی یەكانی بەرێوەبەری رۆشنبیری جەماوەری لە هەولێر رۆژی دووشەممە رێكەوتی 12/12/1983 ئێوارە كۆڕێكی خنجیلانەو بەچێژ بۆ



مامۆستا ئەسعەد عەدۆ سازکرا ، بەناونیشانی
[ بەیتی شۆڕ مەحموود ـ لەئەدەبی فولکلۆریدا ]

کوڕەکە ماموستا عەزیز حەریری بەڕێوەی دەبرد ، سەرەتا بەم جۆرە لەگەڵ ئامادەبووان دوا ! [ ... ئەمجارەیان ڕوو دەکەینە دونیا فراوانەکەی فولکلۆری میللەتەکەمان و بەبەیت و سەر بردە شیرین و پرچێژەکانی کوردەواریماندا دەچینەوە ، بۆئەوەی سوود لەو بەسەرهات و ڕووداوە بەکەڵکانە وەربگرین کەباوک و باپیرانمان لەڕۆژگارێکی زووەوە ئاشنای بوون و دەماودەم بۆیەکتریان دەگێڕایەوە ... ] دوابە دوای ئەو چەند دێڕە مامۆستا ئەسعەد عەدۆی پێشکەش بەئامادە بووان کرد .

**ـ بەرکولێك ـ**

مامۆستا ئەسعەد عەدۆ بەرلەوەی بەناخی باسەکەیدا بچێتە خوارێ یەکسەر نموونە لەبەیتی ـ شۆڕ مەحموود ـ پێشکەش بکات لەشێوەی بەرکولێکی بەتام و چێژدا .. ڕێگای بۆ باس و لێکۆڵینەوەکەی پاك کردەوەو هۆشیارانە هەوڵی‌دا ، ئامادەبووان هەر لەسەرەتاوە هۆگرو شەیدای باسەکەی بین و سەرەتابەم جۆرە دوا :

[ ئەی ئەوانەی وشەی کوردی بۆتە هەوێنی هەویراوتان ، لەم بەرهەمە ئەدەبی‌یە فولکۆریەمدا ، دەمەوێ کەمێك دەست و بازو هەڵماڵم بۆ زاخاوی میشك بخزێمە نێو دەریای گەنجینەی میللەتی کوردمانەوە ، بامنیش ڕکێف لەسەگلاوی خۆم بدەم ، بۆ ئەوەی خۆم لەگەردەلولەی ئەوشۆڕە سوارانەی ڕێچکەی ئەدەبی فۆلکلۆری کورد بدۆزمەوە ، بەخۆزگەی خزمەت و جێ‌بەجێ کردنی ئەرکی سەرشانم ، وەك ئەدەب دۆستێکی کورد ، تەتەلە کردن و ساخ کردنەوەی ئەو داستانە یائەوبەسەربردە قارەمانێ تیەو ئەڤینەی کەنێوی (شۆڕ مەحموود) ە لەئەستۆبگرم .. ] دوا بەدوای ئەوە وتی :

[ لەهەمووان ئاشکراو ڕوونە کەمیللەتەکەمان خاوەنی گەنجینەیەکی زۆرو تایبەتی خۆیەتی ، هەروەها دەیان ڕۆشنبیری گەلەکەمان ئارەقەی ماندوویەتی بۆرشتووەو ئەنجامەکەشی چەندان کتێب و بەرهەمی جیاجیا بڵاوکراوەتەوە چ لەسەر کاسێت یان لاپەڕەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا . مامۆستا ئەسعەد عەدۆ دوای ئەوپێشەکی‌یە باسی سەربردەی شۆ مەحموود دەکات و دەڵێ :

[ دەگێڕنەوە لەسەر ئەو زەمینە بەتایبەتی لەخاکی کوردستان دوو برا هەبوون ، هەریەك لەو برایانە منداڵێکیان هەبووە . یەکێکیان نێو (مەحموود) لەبەر ئەوەی شورە سوار بووە ، بۆ بەنێوی (شۆڕ مەحموود) ناسرابوو ، ئەوی تریان دۆتما (شورە مەحموود) نێوی (مەرزن) بوو ، لەبەر خۆشەویست بەمەرزن گیان بانگ دەکرا هەر لەو ڕۆژەی کەپشتیان کەوت سەر بێشکە بۆیەکتر دانران ، بەڵام تەمەن کورتی و بەد بەخت (شۆڕ مەحموود) باوکی ڕفاند .. ئەو جوامێرە کەوتە ژ دەستی مامە ڕەشەی مامی !!.

کاتێ (مەرزن گیان) گەیشتە ڕادەی میردکردن ، باوک کەوتە پیلان دانان ، پێش ئەوەی (شۆڕ مەحموود) داخواز (مەرزن) بکات ! بۆ ئەو مەبەستە ، ڕۆژێکیان باوکی (مەرز بانگی برازاکەی کردو پێی گوت : « هەر وەك زانیومە . فەرمان ڕەوای تورك نیازی هێرش کردنی وولاتەکەمان دەکا بۆیە دەمەوێ دەستی خۆمان بەپێش بخەین ! » .

( شۆڕ مەحموود) یش بە ڕوگرژیەوە سەری بۆ لەقاند چوونکە لەقسەکردنی مامی بۆی دەرکەوت کەئەوەپیلانە : ]

ئیدی هەر لەبەرڕۆشنایی سەربردەی شۆڕ مەحموو ئاشکرا کێشەو تەنگو چەڵەمەکە دەر دەکەوێ .... بۆیە د بەدوای ئەو سەربردەیە موحازیر یەکسەر پەنای بۆ بەیتە بردو ئێمەش لێرەدا بەپێی پێویست و گونجان چەن نموونەیەکی لێ پێشکەش دەکەین

سەرەتای بەیتی شۆڕ مەحموود وا دەست پێ‌دەکات :

« کێژێ بێ باسەت و باسەت پێ نەدراوی
ئەوە شەڕە ئێستا دەست دەینە مەقەندالی
بابت دەمنێرێتە سەفەرێ تێ‌ناگەم نەبەبرینداری دێمەوە
نەدێمەوە بەکوژراوی .
نە بەنەخۆشی دێمەوە نە بەئەنگاوی
زەردە مەمکانت لەمنێ غەریبێ حەپس کردوە لەژێر کراسەک
مەخمەلی دا بەمیسالی هەرمێ گولاوی مئموونی : دوعا بەخێر
بۆ بکە ئێستا لێ نەقەوماوێ
ئەمن دەچمەوە سەفەرێ تەرك و تورکانی
ئەتو دەبی زۆر گەلێك خوێنت بێتەوە لەدووچاوی .

وەختەك ئەگەر شۆر مەحموود هات ئەدەب شیرن لاوە
پێی بڵێ مەرزن‌گیان دەگەڵ مامەڕەشی ڕۆیین بۆبەڵەخ و بوخارایە

ئەمجا گەڕاوە لەکنە من برەك ڕاوەستاوە
فرمێسکی دەهات لەدووچاوە .
مامۆستا ئەسعەد عەدۆ دوابەیتی شۆر مەحموودی بەم جۆرە کوتایی پێ‌هێنا :

چەند ڕۆڵەی جوان چەندبالا نەستەرەن
هەمووی چاوەڕێی حەوزی کەوسەرن
چەند میرو بەگلەر چەند پەر بەسەرن
عاقیبەت دەبێ خەبەری مەرگ بەرن

بەوجۆرە کوتایی بەوئێوارە کۆڕەهات شایانی باسە زۆر بەگەرمی لەلایەن ئامادە بووانەوە مشتو مڕی لەسەرکراو چەند مامۆستایەك باری سەرنجی خۆیان دەربڕی .

« ئەسعەد عەدۆ رەسول بندیان »

* سالی 1955 لەگوندی [ قورشاغلو ] ی سەربە شاری پیرە هەولێر لەدایك بووە .
* تاپۆلی چواری سەرەتای لەقوتابخانەی قورشاغلو خوێندوەو پۆلی شەشی سەرەتای لە قوتابخانەی (إبن المستوفي) تەواوکردوە .
* ئێستا قوتابی پۆلی پێنجی ئامادەیی یە (بەشی ئەدەبی) ولەهەمان کاتیشدا فەرمانبەرە لەبەڕێوەبەرایەتی بەرژەوەندی گواستنەوەی هەولێر .
* لەسالانی حەفتادا یەکەم بەر ‌ەمی ئەدەبی (کورتە چیرۆك) بەناونیشانی [ یادی رۆژانی ماکۆك ] لەگۆڤار ‌ ‌خەباتی لاواندا بلاوکردۆتەوە .
* لەسالی 1980 دا ناملکەیەکی بە ناونیشانی (پێناسی بەشێکی شاعیرانی کورد) بەچاپ گەیاندوە .
* سالی 1980 [ دڵی شاعیر ] ی بەچاپ گەیاندوە .
* سالی 1981 [ رێزی نان‌بگرن ] چاپ کردوە .
* دوابەرهەمی ناملکەیەکی فۆلکلۆری‌یە بەناونیشانی [ بەیتی ئایشە گوڵو لەشکری ] یە کەلەلایەن ئەمینداریتی رۆشنبیری و لاوان سالی 1983 بەچاپی گەیاندوە .

**کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی کورد**
**لە هەولێر**

لەیەکێ لەو دەزگاو کۆمەڵە رۆشنبیری و ئەدەبیانەی سالی پار گورج و گۆڵ و چالاکی یەکی بەپێزو بەردەوامی رۆشنبیری و هونەری بینی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی کورد بوو لە هەولێر ، بەپێی ئەو بارو دۆخ و زروفەی بۆی هەڵکەوت لەتێکڕای بواری هونەری و رۆشنبیری و ئەدەبی‌دا چالاکی نوان .. لەبەر رۆشنایی ڕاپۆرتی ئیداری و هونەری کەسەرۆکی پێشوی کۆمەڵە بەبۆنەی هەڵبژاردنی دەستەی نوێ‌یەوە پێشکەشی کرد بریتی‌یەلە :

1 — کۆمەڵە (11) پێشانگای نیگاری کردۆتەوە ... دوانیان لەرەواندوز و دوانی بەشی کۆمەڵە لە هاوینە هەواری (صلاح الدین)
2 — کۆمەڵە (7) لەوپێشانگایانەی تایبەت بووە بە هونەرمەندێك و دووانیان هاوبەش لەگەڵ سێ پێشانگای نیگاری منالان .
3 — پێشانگایەکی بۆ خۆش نووسی سازکردوە .
4 — پێشانگایەکی بۆ وێنەی فوتۆگرافی و یەکێکی بۆ سلایدی رەنگاو رەنگ کردۆتەوە .

**لەهونەری شانۆگەریدا**

سالی‌پار کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی کورد لەهونەری شانۆگەریدا شان بەشانی چالاکی‌یە هونەری‌یەکانی دی هەنگاوی نەناوە ، زۆربەی هەوڵ و تەقەلای هونەرمەندانی ئەم بوارە بۆ ئامادەکردنی دەقی [ کەوەکانی قەرە چوغە ] تەرخان کراو کەچی لەگەڵ ئەوەشدا فریای سالی 1983 نەکەوت خۆی کوتایە سنووری چالاکی سالی 1984 وە ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم چالاکی‌یە هونەریانەی پێشکەش کرد

1 — شانۆگەری [ بەزۆرکراو بەدکتور ] لەنووسینی : مۆلێرو دەرهێنانی کاك فەرهاد شەریف .
2 — شانۆگەری [ بانیکەو دووهەوا ] لەنووسینی : برێخت هەروەها کۆمەڵە جگەلەوەی دوو کۆڕی ئەدەبی ساز کردوە ؛ یەکێکیان لەشاری هەولێرو ئەوی دیان لە هاوینە هەواری [ صلاح الدین ] .. ئەمەو سەرەڕای ئەوەی لەبواری ئاوازو موسیقاشدا گەلێ چالاکی پێشکەش کردوە بە تایبەت لە شاری رەواندوز .

شایانی باسە ئەوچالاکی هونەری و رۆشنبیریانە تەنیا هی سالی [ 1983 ] یە

**هەڵبژاردنی دەستەی بەڕێوەبەری نوێ**

دەستەی گشتی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی کورد ـ لقی هەولێر ، لەئێوارەی رۆژی 3 / 1 / 1984 دا بەمەبەستی هەڵبژاردنی دەستەی بەڕێوەبەری نوێ کۆبوونەوە .

لەپێشەکی کۆبوونەوەکەدا سەرۆکی پێشوی کۆمەڵە ڕاپۆرتی هونەری و ئیداری خوێندەوە دوابە دوا ئەو ، ژمێریار ڕاپۆرتی دارایی خوێندەوە

پاشان دەست بەهەڵبژاردن کراو لەئەنجامدا ئەم برایانە سەرکەوتن :

1 — عبدالوهاب تالەبانی سەرۆك
2 — عبدالله خضر پشدەری سکرتێر
3 — طلعت سامان بەڕێوەبەری هونەری
4 — فارس سعدی
5 — دارامحمد علی
6 — فەرهاد شریف
7 — رەسمی جلال

هەروەها ئەم برایانەش بەئیحتیات دەرچوون :

1 — کریم بایز رجب .
2 — صلاح مهدي .

# لەسلێمانی

ـ ئاسۆس ـ ئامادەی کردووە

دوا کۆڕی چالاکی ڕۆشنبیری ی ساڵی 1983

یەکێك لەو کارانەی دەبێتە هۆی دڵشادبوونی ڕۆشنبیران بابەخدانی مامۆستایانە بە ئەدەب و زمانی کوردی ، لەپاڵ ئەوەدا کە چەندین ڕۆشنبیری وامان هەیە بە خواست و ئارەزووی خۆیان بەشی کوردییان لە کۆلیجی ئەدەبیات هەڵبژاردوەو پاش دەرچوونیان وەك عاشقێك خۆیان بە دەوری ووشەی کوردیدا ئەگێڕن ، بەداخەوە تاك تاکەی واشمان هەیە هەر دوای وەرگرتنی باوەڕنامەکەی ئیتر بەتەنگ ئەوەوە نییە تەنانەت ڕۆژنامەش بخوێنێتەوە .

وەك بێتە بیرم سێ نموونەی دیار لە دەفتەری یادگارەکانما دەربارەی پەرۆشی هەندێ لە ڕۆشنبیران بەرامبەر بەشی کوردی تۆمار کراون ، لەوانە یەکێ لە خوشکان ساڵی 1966 لە کۆلیجی ئابووری و بازرگانی وەرگیرابوو ، بەڵام وای بە باشتر زانی کە بچێتە بەشی کوردییەوە ، خوشکێکی تر لە یەکەم ساڵی کردنەوەی زانکۆی سلێمانیدا لە بەغداد لە بەشی کوردی وەرگیرابوو ، کەس و کاری هەواڵیان بۆ نارد کە بێتەوە بۆ سلێمانی لە کۆلیجی ئەندازە وەرگیراوە ، لەگەڵ ئەوەشدا کە قوتابییەکی لێهاتووبوو ، وەتوانای ئەو کۆلیجەشی هەبوو ، بەڵام هەر لەبەشی کوردیدا مایەوە . سێیەمیشیان هەروەك ئەو دوو خوشکەی تر بەشی کوردی بەلاوە پەسندتر بوو لە کۆلیجەکانی تر . جا ئەگەر قوتابییەك بەو سۆزەوە خوێندنی کوردی هەڵبژاردبێ بێگومان لە مامۆستایەتیەکەشیدا هەمان خۆشەویستی بۆ ئەدەب و زمانەکەی ئەبێ و هەرواش قوتابییەکانی پەروەردە ئەکات . یەکێك لەو مامۆستا سەرکەوتوانەی کە ئەدەب و زمانی کوردی لە قوتابخانە ناوەندی و ئامادەییەکاندا ئەڵێنەوە مامۆستا (سعاد صالح سعید) ە ئێوارەی ڕۆژی 28/12/1983 لە هۆڵی لقی ڕاهێنانی



سەر بە پەروەردەی سلێمانی کۆڕێکی فراوانی بۆ تەرخان کرا کە وانەیەکی نموونەیی ئەدەبی کوردی لەبەر چاوی مامۆستایانی زمانی کوردیدا بڵێتەوە .

بابەتی دەرسەکەی « ژیان و شیعری فائق بێکەس » بوو ، زۆر زیرەکانە خوشکە سعاد ڕۆژی 18/12/ ی بۆ ئەم مەبەستە دەستنیشان کردبوو بە بۆنەی تێپەڕبوونی (35) ساڵ بەسەر کۆچی دوایی شاعیرا ، بەڵام لەبەر هەندێ هۆی تایبەتی کۆڕەکە خرایە ڕۆژی 28/12/1983 . بۆ ئەم مەبەستە خوشکە سعاد صالح سعید قوتابییانی پۆلی دووەمی ناوەندی ئامادەکردبوو ، وە دەرسە نموونەییەکەی پێ ووتن .

بە شێوەیەکی ئەدەبی جوان ، هێمن و لەسەرخۆ بە هاوبەشی کردنی قوتابییەکانی ـ کە بریتیبوون لە پۆلی دووەمی قوتابخانەی ناوەندی هەواری کچان کەوتە باسکردنی شاعیر : ژیانی تایبەتی و خێزانی ، قۆناغی خوێندنی ، هاوبەشیکردنی لە بزوتنەوەی نەتەوەییدا ، ئەمجا ڕوونی کردەوە کە بۆچی شاعیر ئەم نازناوەی بۆخۆی هەڵبژاردووە .

پاشان مامۆستا سعاد هاتە سەر شیعرەکانی : شیعری نەتەوایەتی ، شیعری کۆمەڵایەتی ، هەستی دەروون ، هۆنراوە بۆ منالان ، سروود بۆ قوتابییان ، وەبۆ هەریەکەش لەم بابەتە شیعرییانە نموونەی ئەهێنایەوەو قوتابیەکانی تەواویان دەکرد .

لە کۆتایی وانەکەیدا مامۆستا ئەو ڕاهێنان و گفتوگۆیەش کە لە کتێبەکەیاندا هەیە ئەوەشی بە شێوەی پرسیار و وەڵام بە قوتابییەکان شیکردەوە . دواشت کە داوای لە قوتابییان کرد بۆ

جێبەجێکردنی بۆ دەرسی ئایندە : ئەم دێرە شیعرەی بێکەس بوو .

**داری ئازادی بە خوێن ئاو نەدرێ قەت بەرناگرێ**
**سەر بە خوێی بێ فیداکاری ئەبەد سەر ناگرێ**

داوای لێکردن کە لە شێوەی پەخشانا دای بڕێژن و بۆ دەرسی داهاتوو ئامادەی بکەن .

پاش تەواوبوونی وانە نموونەییەکە لە لایەن مامۆستا عبدالرحمن صالح و مامۆستا فاضلەوە کە سەرپەرشتیاری پەروەردەیی زمانی کوردین وە مامۆستا فۆاد رۆوف صراف بەڕێوەبەری قوتابخانەی (الوطن) سەرۆکی لیژنەی کوردی دەرسەکە بە باشی هەڵسەنگێنراو پیرۆزباییان لە مامۆستا سعاد کرد ، لە دواییدا لە لایەن مامۆستایانی زمانی کوردیەوە چەند پرسیارو تێبینیەك پیشان‌درا ، بەم شێوەیە کۆڕەکە کۆتایی هات بە هیوای بەیەك گەیشتنەوەیەکی‌تر لە کۆڕەکانی لیژنەی کوردی قوتابخانە ناوەندی و ئامادەییەکاندا .

### یەکەم چالاکی رۆشنبیریی ساڵی 1984

لە کۆتایی ساڵی 1983 دا چیرۆکنووس مامۆستا شێرزاد حەسەن کۆمەڵە چیرۆکێکی بە ناوی (تەنیایی) یەوە بەچاپ گەیاند ، ئەم کتێبە لەلایەن ئەمینداریێتی رۆشنبیری و لاوانەوە یارمەتی دراوە ، چیرۆکەکانیش بریتین لەمانە :

1 – ڕیشوڵە . 2 – ئەو شەوەی سەگم تیا خۆش‌ویست .
3 – خوشکەکان 4 – ترس . 5 – لەودیو دەرگا ئاسنینەکەوە .
6 – بێوەژن . 7 – گرێ . 8 – تەنیایی شەوێکی باران .
9 – شاعیر .

بۆ هەڵسەنگاندنی ئەم چیرۆکانە بەڕێوەبەرێتی رۆشنبیریی جەماوەر لە سلێمانی رۆژی 1/1/1984 لە هۆڵی کتێبخانەی گشتی ئێوارە کۆڕێکی بۆ رۆشنبیری لاو کاك بەهات قەرەداخی سازکرد ، سەرناوی باسەکەی کاك بەهات ئەمەبوو [ چرکەی دەروونی و وێنەی هونەری لە تەنیاییدا ] . شاعیری لاو کاك



جەمال غەمبار کۆڕەکەی هەڵدەسووڕاند . باسەکە بەتەنیا سەعاتێك و پەنجا دەقیقەی خایاند ، ئەوەی دەگەیاند کە زۆر خۆی تێدا ماندووکردووە ، وەڕێگایەکی نوێی لە شێوازی بەرنامەکەیدا هێنابوو کە گەلێ لایەنی چیرۆکەکانی یەکالا دەکردەوە ، ئێمە لەلای خۆمانەوە سەرجەم چەند تێبینیەکمان هەبوو لێرەدا بەکورتی پیشانی دەدەین :

1 – کاك بەهات نموونەیەکی هێنایەوە گوایا یەکێك وتویەتی چیرۆکێکی نوێم خوێندەوە خێرا چیرۆکێکی کۆنم بەسەرا کرد تا بۆم هەرس ببێ وە ئەمەشی خستە پاڵ (کەلە نووسەرێك) ، بەڵام ئەوی ڕاستی بێ ئەم مەسەلەیە بریتیە لە (نوکتە) ی هونەرمەندێك کە جارێکیان بۆ پێکەنین بە هاورێیەکی وتبوو : چیرۆکێکی ئەم سەردەمەم خوێندەوە بە پەلە چووم چیرۆکێکی پەنجاکانم بەسەرا کرد بۆ ئەوەی هێلنج نەدەم . ئەگینا مەسەلە چیرۆکی کۆن و چیرۆکی نوێ نییە ، مەسەلە چیرۆکی چاك و چیرۆکی خراپە ، هەرگیز چیرۆکەکانی چیخەف و گۆرکی کۆن نالێن !.

2 – پێشەکی باسەکە زۆر دوورو درێژبوو ، وە شتی زیادەی تێ ئاخنرابوو کە لە توانایدابوو خۆی لێ رزگار بکات و ڕاستەوخۆ بچێتە سەر باسەکە بە شێوەی - رەخنەی تەتبیقی - ..

3 – لە چیرۆکی (خوشکەکاندا) مەسەلەکەی بە شێوەی کێشەی چینایەتی لە قەڵەمدا ، کە لە واقیعدا وا نییە ، سێ خوشکن ، دوانیان شوو ئەکەن و یەکێکیان بە تەنیا لە ژوورەکەدا ئەمێنێتەوە ، ئەمەندە رقی لە ژیان و لە دەوروبەرو لە بارو دۆخی خۆی هەڵئەسێ داخی دڵی بە وێنەکەی خۆی ئەرێژێ و ئەیشکێنێ .

4 – لە چیرۆکی (گرێ) دا کاك بەهات وتی : کابرای کوێرە کە



بێ‌بەری کرا لە کورپەکەی شێت بوو ، لە ئەنجاما بڕیاری‌دا ئیتر نوێژ نەکات (چونکە شێت نوێژی لەسەر نییە) .
لەڕاستیدا ئەگەر بەووردی لەو چیرۆکە ورد ببینەوە دەبینین مەسەلەی نوێژ نەکردنی مەلا کوێرە پەیوەندی بە شێت بوونیەوە نییە ، بەڵکو پروتستۆیەکە بەرامبەر بە کۆمەڵگاو بە ئایینیش .

5– کاک بەهات تێکڕای چیرۆکەکانی لە (تەوەرە) ی تۆڵەدا کۆ کردەوە کە ناوەرۆکەکانیان بریتین لە تۆڵەسەندن و بەدوای تۆڵە دا گەڕان ، بەلام ئەوەی ئاشکرایە تێکڕای چیرۆکەکان [ تەنیایی ] کۆیان دەکاتەوە نەک تۆڵە .

6– زاراوەیەکی بەکارهێنا سەبارەت بە پاڵەوانی یەکێ لە چیرۆکەکان و سیفەتی (سادی) بەسەرادا ، بەلام ئەو جۆرە حاڵەتانە ناچێتە خانەی (سادیە) وەو بە (ماسوشی) ئەژمێرری .

7– کاک بەهات ڕەخنەی لە هەندێ وەسف هەبوو بە (صوری شیعری) دائەنان و ئەیوت : ئەمە بۆ چیرۆک دەست‌نادات بەلام ئەشێ بۆ شیعر دەست بدات ، لەڕاستیدا دەبوو وا بۆ مەسەلەکە بچێ کە چیرۆکنووس نەدەبوو چیرۆکەکانی لە (صوری شیعریدا) نوقم بکات وە خێرا هەر شتێ لێرە دەست نادات بەرەو ڕووی شیعری نەکردایەتەوە .

8– خاوەن باس گلەیی لەم وەسفە هەبوو (خەوێکی پەمەیی) گوایا ئەمە کوردانە نییەو کورد وا نالێ ، لەکاتێکدا کە ئێمە دەبێ ئەوە بزانین جیاوازی لە نێوان قسەکردنی ئاسایی و زمانی ئەدەبیدا هەیە . دەنا خۆ هیچ عەرەبێکیش لە شۆڕیجە نالێ : (بارحه حلمت حلم وردي) . یان بێینە سەر ناونیشانی باسەکەی کاک بەهات (چرکەی دەروونی) خۆ ئەگەر بەو پێوانەیە ئەمەش سەیر بکرێ ئەوا دەبوو بڵێین : ئەی کەی کورد وتویەتی : « چرکەی دەروونی » ، بەلام مەسەلە لێرەدا بریتیە لە زمانی ئەدەبی .

9– کاک بەهات زۆر سەرنجی ووردی هەیەو بایەخیش بە زمان دەدات بە تایبەتی لەو ڕەخنانەدا بۆمان دەر دەکەوێ کـ لەسەر وەرگێڕان بلاوی دەکردنەوە ، کەچی لەم باسەیدا ڕستەیەکی زۆر نـاسـازمـان بـەر گـوێ کـەوت « پێ هەڵئەستێ » کە باش ئەزانین ئەم ڕستەیە کوردی نییـە وەرگێڕانی « يقوم به » ی عەرەبییە .

دوای تەواوبوونی باسەکە دەرگای گفتوگۆ لێ‌دوان کرایەوە مـامۆستـا عبدالكريم حسن سەبـارەت بە شـەپۆلی هـۆش هـەلۆیست و قفڵ و سـاتی کۆتـایی ، چینـایـەتی لە پێشـەک باسەکەدا و نەبوونی لە ناوەرۆکی چیرۆکەکاندا ، ناکۆکی نێوان وێنـەکان ، مـەودای زەمـەن و خـاڵەکـان ، ئـاگـاداربـوونی مستقبلیەت ، سەبارەت بەم خاڵانە دوا پاش ئەوەی پەنجەی ب ماندووبوونی خاوەن باس ڕاکێشا .
ئەمجا مامۆستا حەسیب قەرەداخێ چەند تێبینی و سەرنجێک پیشاندا (باوکانە) نەبوون (ئەدیبانە) بوون لەوانە :

أ – وێنەی نەگونجاو لە چیرۆکداو بـەرەو ڕوو کردنـەوەی بۆ شیعر .
ب – دەربارەی بورژاو ، خێرو شەڕو چاک و خراپ .
حـ – ئەبوایە « اكتفا » ی بە خوێندنەوەی باسەکە بکردایـە نەک بۆشی (شرح) بکردینایە .
ء – دەبوو لەگەڵ کاک شێرزادا دانیشتنی تایبەتیان بکردایە تەنانەت بۆ فۆنەتیکیش .

دوای ئەویش کاک محمد عثمان کاک شێرزادی بە (قنبلة الموسم) شوبهاند . ئەمجا باسی ئەمانەی کرد : شەپۆلی هۆش ، ايقاع ، جیهانی ناوەوەی مرۆڤ ، صوری شیعری و صوری چیرۆک ، ناتەواوی تـەعریفی شیعـر ، باس‌کـردنی بەربـوونی خۆینی ناوەوەی پاڵەوانی خوشکەکان .هەروەها گلەییشی لەوەکرد کە بۆچی ئەم باسە بێ سەرچاوە بوو ؟. لە وەڵامی ئەم گلەییەدا کاک بەهات قەرەداخی ووتی :
« پشتم بە هیچ سـەرچاوەیـەک نەبـەستوە ، بـەلام (ضمنا) ئاگاداری گەلێ مەسەلەی ترم وە ئەشێ سوودم لەم دوو بابەتەی خوارەوە وەرگرتبێ 1 – علم النفس الفرويدي 2 – النظرية المادية في المعرفة . لە دواییدا کاک حەمە عەلی لە ڕۆشنبیرە لاوەکـان

